

پێنجەم فرمانو دەستووری یاسایییەکان: ئەوەش ئەو فرمانانەیە کە نێوان دەسەڵاتدار و تاك، سنووری مافو ئەرك دیاری دەکات.

کۆمەڵێ بنەماو یاساو رێسای پتەو و نەگۆڕ دیاری دەکات کە لەگەڵ سروشتی مرۆڤ وەك گیانەوەرێکی شارستانی ژیرو بەفام و گونجاوو سازەو لەقورئاندا بەدەقی گشتی لەدە ئایەت داهاتووە وەك بنەمای راوێژ ﴿ وامرهم شوری بينهم ﴾ الشوری-٣٨. هاوڕازی لەبەرپرسیاریدا ﴿وتعاونوا على البر والتقوى ولاتعاونوا على الاثم والعدوان ﴾ المائدة-٢. گوێ رایەڵی بۆ رابەرو پێشەوا ﴿ يا أيها الذين آمنوا اطيعوا الله واطيعوا الرسول واولي الامر منكم ﴾ النساء٥٩. ﴿ واذا حكمتم بين الناس ان تحكموا بالعدل ﴾ النساء٥٨.

شەشەم فرمانەکانی یاسای نێونەتەوەیی و دەوڵەتی کە ئەوەش بێگومان کاروباری پەیوەندی نێودەوڵەتی ئیسلامو دەوڵەتانیدی رێك دەخات لەئاشتی، لەجەنگ. لەبانگ کردن بۆ ئیسلام و مامەڵەی دیلو بەندو داگیرکردن ودابەش کردنی دەستکەوتی جەنگ و پەیمان و ئاشت بوونەوەو ئاگر بەستو مافی ئەوانەی لەژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلام دەژین و پارێزگاری ئایینی خۆیان دەکەن کە ئەوەش لە (٢٥) ئایەتدا هاتووە وەك ﴿ وان جنحوا للسلم فاجنح لها وتوكل على الله ﴾ الانفال-٦١، ﴿ وقاتلوا في سبيل الله الذين يقاتلونكم ولا تعتدوا ان الله لايحب المعتدين ﴾ البقرة-١٩٠. ﴿ فمن اعتدى عليكم فاعتدوا عليه بمثل ما اعتدى عليكم واتقوا الله واعلموا ان الله مع المتقين ﴾ البقرة-١٩٤.

حەوتەم فرمانەکانی دادوەریو دادگاو بڕ بڕکردنی ناکۆکی نێوان داواکارو داوا لێکراو، کە ئەوەش هەموو ئەرکوکاری قەزاوەت و بەرزکردنەوەی داواو بڕیاری دادگایە بەشێوەیەك کە دادی تەواو بدات بەهەموو خاوەن مافێكو لەبارەیی شایەتیو سوێند خواردنو یەکسانی لەدادوەریدا کە بێگومان بنەماکانی شەریعەتی ئیسلام سەرچاوەی گشت جارەکانی مافی مرۆڤ و سەربەخۆیی دادگاو بیادەکردنی دادی کۆمەڵایەتیو بەرپرس لەتاوان و لێبوردن. وە ئەوەش بەئیجمالی لە (١٣) ئایەتدا هاتووەو ئەنجامدان و باس کردن وەردەکاریی رووداوەکانی رۆژانە بۆ فرمانەکانی پێغەمبەرو بۆچوونی موجتەهیدەکان ماوەتەوە وەك ﴿ واستشهدوا شهيدين من رجالكم ﴾ البقرة-٢٨٢. ﴿ ومن لم يحكم بما انزل الله فاولئك هم الظالمون ﴾ المائدة-٤٥.

هەشتەم فرمانی تاوانەکان و سزاکانو سەرزو سنووری گشت تاوانەکان دیاری دەکات و ئەوەش بۆ پاراستنی پێویستی مرۆڤە کە پێنج بەشە، ئاین و باوەڕ، گیان و لەش، ماڵو سامان، فامو ژیری، ناموسو شەرەفو ناوبانگەکە بێگومان تاوان بەرامبەر بەو شتانە تاوانە دژی مرۆڤ بەتاك یان بەکۆمەڵ یان بەرەوشت و دابو نەریت وەك دزی و بوختان و کوشتنو داوێن پیسی و مەی خواردنەوەو رێگری، کە ئەوانە هەریەکە حەدی خۆی هەیە کە بریتین لەتوڵە، حەد، سەرزەنشت و تەمێ کردن کە قورئان لە (٣٠) ئایەتدا باسی کردووە وەك ﴿ كتب عليكم القصاص في القتلى ﴾ البقرة-١٧٨. ﴿ السارق والسارقة فاقطعوا ايديهما ﴾ المائدة-٣٨.

ئەوە بەشەکانی شەرعی ئیسلامە کە وەك روونو ئاشکرایە هەموو لایەنەکانی ژیانی مرۆڤی گرتووەتەوە و یاساکانی دەست کرد لەگەڵ ئەو هەموو جیاوازیو گۆڕانکاریو هەموار کردن و پینەوپەڕۆی لەسەری دەکرێ ناتوانی بەئەندازەی گەردیلەیەك رەخنەی لەسەر بنەمایەکی هەبێتو یاسایەکی خواییەو بەتاقیکردنەوە دەرکەوتووە کە لەهەموو یاسایەك خۆڕاگر و چەسپاوو نەمرە، چونکە شەرع پەیوەندی بەندەو خوا بەیەکەوە دەبەستێ، پەیوەندی بەندەو بەندە بەیەکەوە گرێ دەدا، پەیوەندی بەرەوشتو عورفی چاكو رەسەنەوە هەیە نەوەك یاسای دەست کرد لەبەرە ئەوە سامانێکی دەوڵەمەندمان هەیە ئەگەر بتوانین پیادەی بکەینو جێبەجێی بکەین.

خوا یاربێ ئەوەش نەوەك ئاواتو خوازیارە، بەڵکو لەبەردەست و دڵانەو پانزە سەدەیە جیهانی ئیسلامی لەسەری دەڕوات و بەهیچ شێوەیەك پەکمان نەکەوتووە بۆ هیچ رووداوێك و هەرگیز جیاوازیی نێوان زانایان کاری نەکردووەتە سەر رەوتی یاسایيو دەستوری کۆمەڵگەی ئیسلامی، چونکە ئەرکی مرۆڤی بەربار کە واجب و قەدەغەو نەدبو کەراهەو اباحەیە هەمووی لەکتێبو سونەدا هەیەو هەر ئەم دوو سەرچاوەیە رێگەیان داوە کە کار بە (اجماع) و( قياس) و( مەصالح) و (اجتهاد) بکرێ لەشوێنێك کە دەق نەبێ.

ئەو بۆچوونو بیروڕایە کە لەدوو سەرچاوەو سەرچاوەکانی تر وەرگیراون ناونراوە بە (فقه) کە بەکەمێ جیاوازی لەبۆچووندا وەرگیراوە و نووسراوەو هەندێکی خاوەنی هەیەو هەندێك بەوشەی (قيل) وتراوەو ئاماژەی پێ



کراوە کە ئەوەش هێزو پێزی بەفقە داوە. چونکە بەئەندازەی رووداو دەق نی‌یەو ناش بێ هەبێ و ئەم ئاینە لەزمانی عەرەبی هاتووەو ئەویش (ماشاء الله) ئەوەندە دەوڵەمەندو بەهێزو واتەو فرە وشەیە بەپێویست دەبێتە هۆی جیاوازی لەراوبۆچووندا.

لەرووی فەرموودەوە شێوازی کار پێکردنی رێبازی جیاواز و بەڵگەنەویستە دەبێتە هۆی دەمەتەقێو گفتوگۆ لەگەڵ ئەوانە هەورمووی لەبیرمان نەچێ کێشەی جیاوازی (قراءە) واتە خوێندنەوەی قورئان و زاراوەی (ناسخ)و (مەنسوخ) و (عام) و (خاص) و (موتلەق) و (مقید) هۆیەکی ترە بۆ جیاوازی لەفقەداو بەدیمەن جیاوازی زەق‌و رەق هەیە.

زانایان لەنێو خۆیاندا دوو رێگەی جیاوازیان گرتووە، یەکەم ئەوانەی کە راو بۆچوون‌و قیاس‌و مصالح‌و استحسان پەسەند دەکەن‌و زۆر لەئەرکە ئایینییەکان بە هۆکاری سازو پەسەند دەچەسپێنن و هەمیشە بەژیری و فام مامەڵە لەگەڵ دەقەکان دەکەن و کات‌و شوێن‌و کەس‌و ژینگەیان لەبەر چاوە، دووەم ئەهلی فەرموودەیە کە هەوڵیان داوە بۆ هەموو رووداوێك فەرموودەیەك یان دەقێکی قورئان هەبێت، لێرەدا هەموو رێبازەکانی فقە جیا دەبێتەوەو هەندێ زۆر پابەندە بەشێوازو دەق‌و هەندێك پابەندە بە ناوەرۆك‌و مەبەست و لەبەشەکانی ئەم وتارە بەدرێژی باسی‌یان دەکەین خوا حەز بکات.

ئەو درێژە دانە بەم باسە تەنها لەبەر ئەوەیە کە لە قورئان و فەرموودەو سامانی پێشینەمان لە یارو یاوەرو شوێن کەوتووان‌و پێشەوایانی بەتوانا گەورەترین گەنجینە و سامان و کەرەسەی یاسایی و دەستووریمان بۆ دروست بووە کە بەهیچ شێوەیەك پێویستمان نی‌یە پەلاماری یاسای خۆ کردوو دەست کردو دەیان جار هەموار کراو بدەین تەنها ئەوە نەبێ هەوڵ بدەین، کار بکەین بۆ ئەوەی لەسەر رۆشنایی و بنەما گشتی‌و بتەوەکانی هەموو کارو هەرمان‌و بوارەکانی ژیان بەیاسای فقهی ئیسلامی بێت. هەرچەندە کۆمەڵی کوردەواری -سوپاس بۆ خوا- هەموو پێداویستی خۆیان لەرێگەی فقهەوە جێبەجێ دەکەن‌و بۆ هەندێ کاری ژیان‌و ژیوار نەبێ هەرگیز پرسی یاسای دەست کرد ناکەن و کاری پێ ناکات‌و ئەگەر کردی دژی شەریعە نی‌یەو لەیاسای ئیسلامدا رێگەی پێ دراوە وەك تۆمارکردنی سامان لەدەزگاکانی دەوڵەت‌و مارەبرین‌و پول داری‌و مالداری‌و کارو کاسبی و مامەڵە ئەوەش ئەگەر زوو هەموو فقهی ئیسلامی بەزمانی شیرینی کوردی لەبەردەست بوایەو سامانی زمانی کوردی پێ دەوڵەمەند بکرایە ئەو کەمە پرس کردنی بەیاسای دەست کردنی نەدەکراو هەرەواش دەبێ.

## نێوان فقەو شەریعەو یاسا

خۆش بەختانە ئەوانەی کە دەستیان بووەو هەیە لەدانانی یاسادا ئەوەندەی شارەزابوون لەیاساکانی دەرەوە ولاتە بەناو پێشکەوتووەکان دە ئەوەندە شارەزایی فقەو شەرع بوون لەبەر ئەوە بەدەگمەن دژایەتی هەیە لەنێوان فقەو یاساکان ئەگەر لەگەڵ مەزهەب و رێبازێکی دیاریدا هاودەنگ نەبووبێ لەگەڵ سەرجەم بنەماکانی شەرع هاوڕاز بووەو بەرێبازێکی پەسەندی ئیسلامی رەوا بووە، بەلام نێوانی فقەو شەریعە ئەگەر بڵێین هەموو (موجتەهیدێك) لەسەر حەق‌و صەوابە ئەوە هەموو فقهێك شەریعەتەو پێچەوانە نی‌یە واتە فقهەکە گشتی‌یە، بەلام ئەگەر بڵێین مەرج نی‌یە هەموو موجتەهیدێك حەق و صەواب بێت ئەوە هەر کام لەرووبەکەوە گشتی‌یەو لەرووبەکەوە تایبەتە، بۆ روون کردنەوەی ئەم مەسەلەیە دەڵێین: فەرمانی خوا لە هەموو مەسەلەیەکدا کە ئیجتیهادی بێت پەیوەندی بە بۆچوونی موجتەهیدەوە هەر چۆن موجتەهید دەفەرموێ ئەوە فەرمانی خوایە بەوانە دەڵێین راستگر، بەلام هەندێك لەزانایان دەڵێن فەرمانی خوا تەنها یەکەوناب‌ێ بەدوو ئەوەی "مصیبە" ئەوە راستەو ئەوەی دی هەڵەیە و بەوانە دەڵێین هەڵگر.

لەرووی ناوەرۆك و مەبەستەوە شەریعە لەفقهە جیاوازەو بەکۆمەڵێك دیاردەو تایبەتمەندی کە بەم شێوەیە روونی دەکەینەوە، یەکەم شەریعە تەواوەو بێ کەم‌و کوریە، بەلام فقە وانی‌یە چونکە شەریعە وەك یاسانی‌یە هەموار بکرێت. بەڵکو خاوەنی شەریعەت بەشامل‌و کاملی دانا‌وەو هەرگیز کەم‌و کوری تێدا نابێ، بەلام فقە هەندێ جار جیاوازی بیرو رای لەسەرەو حەق تەنها یەکەو نابێ بەدوو.

دووەم شەریعە گشتی‌یەو پەیوەندی بەگشت مرۆڤ‌و کۆمەڵگەوە هەیە. سێیەم شەریعە هەر فرمانێك بدات (الزامی)وئەرکە هەر کەس مەرجی تەکلیفی لەسەر بێ دەبێ شەریعە ئەنجام بدات، بەلام فقە وانی‌یە یاسایەکی ئوصول هەیە (العامی لامذهب لە) واتە عەوام مەرج نی‌یەهەمیشە لەسەر یەك مەزهەب بێت.

چوارەم فقە کە بۆچوونی زانایەکی موجتەهیدەو کێشەی کۆمەڵێك چارە دەکات لەوانەیە بۆ کۆمەڵێکی تر دەست نەدات هەرواشە بەتاقی‌کردنەوە.



# (١٣٠) دانە قورئان لە پەرتووکخانەی میۆنیخ دا

ئا : موحسین مزیری

لەئەلمانیا پەرتووکخانەیەك هەیە بەناوی (ولاتی بافاریە) دەکەوێتە شاری میۆنیخ و بەگەورەترین پەرتووکخانە دادەنرێت لەم ولاتەدا، کەنزیکەی (٦) ملیۆن پەرتووك دەگرێتە خۆی لەپیشانگایەکی تایبەتی‌دا بۆ پیساندانی ئەو قورئانە پیرۆزانەی کەتەمەنیان دەگەڕێتەوە بۆ (١٠٠٠) ساڵ پێش ئێستا(٣٠) دانە لەو قورئانانەی کەبەدەست نووسراون خراونەتە بەرچاوان. ئەم پەرتووکخانەیە (١٣٠) دانە قورئانی تێدایە کەبەگرنگترین و بایەخترین کۆمەڵە قورئان دادەنرێت لەدەرەوەی سنووری ولاتانی ئیسلامیدا ئەم پەرتووکخانەیە تەنها ٣٥ دانەی نموونەیی هەڵبژاردووە بۆ گوزارشت کردن لەو داهاتە گەورەیەی کە پەرتووکخانەکە خاوەنیەتی و مێژووی کۆنترین دانەش دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی ٩ی زایینی کەبەخەتی کووفی کۆن نووسراوەو زۆربەی بۆچوونەکان ئاماژە بەوە دەکەن کەئەم دانەیە لەسوریا نوسراوە. ئەمەو زۆربەی ئەم قورئانانە تەنها چەند پەڕێکیان ماوە هەرچەندە هەندێکیان تا (٢٠٠) لاپەڕەی ماوە کەلەپێستی ئاسك دروست کراون و بەهۆی قەبارەیان گرنگیەکی گەورەیان هەیە. هەروەها دانەکانی ئەندەلووسیش بەکۆمەڵە قورئانێکی بەنرخ و کەم وێنە دەژمێردرێت لەم پەرتووکخانەیەدا بەوپێیەی کە لەکۆتاییەکانی سەدەی (١٥)ی زاینیدا هەموو ئەو قورئانانەی کەلەئیسپانیای ئیسلامی ئەوکات دانووسرابوون سووتێنران پاش ئەوەی کەمەسیحیەکان توانیان بەسەرکردایەتی ئەلیزابیزی شای قشتالە کۆتایی بەدەسەلاتی موسڵمانان بێت، هەرچی ئەو دانانەی کە ئێستاش ماون، ئەوانەن کەمەسڵمانە پەنابەرەکان لەگەڵ خۆیاندا رفاندوویانن و ئەم قورئانانەش لاپەرەکانیان بەزەخرەفەی زۆر سەرنج راکێش و نا ئاسایی نەخشەکێشراوکراون و یەکێك لەو دانانەی کە زۆر بەشێوەیەکی هونەری پێشکەوتوو رازاندراوەتەوە ئەوەیە کە لەسەدەی چوارەو پانزەدا لەنیمچە دوورگەی ئیبێریا نووسراوە کەبێگومان دانەکانی ئەم سەردەمە بەجوانی رازاندنەوەیان بەناوبانگن وزۆر لەم قورئانانەش ماوەی چەندان سەدەیە لەم پەرتووکخانەدا کۆکراونەتەوە ئەم کۆکردنەوەش دوو مەبەستی سەرەکی بەدواوە بووە یەکەمیان بۆ خوێندنەوەو چاوخشاندن بەناوەڕۆکیان داو دووەمیشیان ئەو نرخ و پایەبەرزەی کەلەم قورئانانەدا بەدی دەکرا. لەوانەیە رۆژهەلاتناس (یۆهان ئەلبرشت) (١٥٠٦-١٥٥٧) یەکەم کەس بوو بێت لەسەردەمی راپەڕین (النهضة)ی ئەوروپی‌دا بایەخی بەم قورئانانە دابێت ئەوەی یارمەتیشی داوە بۆ ئەم کارە ئەوەبووە کەزمانی عەرەبی بەباشی زانیوەو بایەخ دانەکەشی بە شێوەیەك بووە کەهەستاوە بەتوێژینەوەی چەندان دەست نووس و پەرتووکێکیشی لەسەر قورئان داناوەو زیاتر لە (٢٠٠) دەستنووسی عەرەبی هەبووەوو پاش مردنیشی میراتی پەرتووکخانەکەی بۆ میر (باتماریە) ماوەتەوەو بۆتە سەرچاوەی پەرتوکخانەی (باتماریە)ی گەورەو بەناوبانگ، شایانی باسە پەرتوکخانەی (دەوڵەتی بافاریە) لەمیونیخ زیاتر لە ٤هەزار دەستنووسی رۆژهەلاتی تێدایەو مێژوونووس و لێکۆڵەرەوەکان لەلیکۆڵینەوەکانیاندا سوودی لێوەر دەگرن.



سەرچاوە رۆژنامەی (الرأي) ئوردنی ژمارە ١٠٣٩٨.





# گەشتێک بەهەواری تەهلیلەو خەڵوەتی حاجی دەروێش برایمی دەفژەن دا

ئەنومر ئیبراهیم بلباس

## کورتەیەك لەژیانی دەروێش

لەگەڵ پەیدا بوونی یەکەم تروسکەی ئیمان و رەوشەن کردنەوەی کوردستان بەنووری خۆری ئیسلام گەلی کوردیش شان بەشانی گەلەکانی تر بەپیر بانگەوازی ئیسلامەوە چووەو بگرە زیاتر قوڵی بۆ خزمەت کردنی پەیامە پیرۆزەکەی خواو پێغەمبەر ﷺ هەڵماڵیوە، هەر لەبواری (تەفسیرو حەدیس و نحو و صرف...)و چەندین زانیاری تر..

گەلی کوردی موسڵمانی خێرەومەند ئەوەندەی لەتواناو هێزی دابووە لەدروست کردنی مزگەوت و خێرات و شتی تر دریغی نەکردووە. خۆ ئەگەر هیچی لەباردا نەبووبێ و بەدەنگی خۆش و بەسۆزەکەی (قورئان)ی پیرۆز یان لەیادە پیرۆزەکانی وەك (مەولودو پرسەو رۆژانی هەینی .. هتد) خوێندوویەتەوە. یابەیانیان زۆربەی موسڵمانانیان بەدەنگی (کەبار)ی ئەڵاهو ئەکبەر (سبحان الله- الحمد الله)وە هەڵدەستاند، ئەوەتا لەبناری چیای قەرەچوغی سەرکەشدا لەدەشتی کەندێناوە گوندی (لهێبان)ی داگیرکراو لەساڵی ١٩٣٠ منداڵێك بەناوی (ابرهیم) لەنبەماڵەیەکی هەژاری دین پەروەری نیشتمان پەروەر چاوی بەیەکەم تروسکەی روناکی چیای قەرەچوغ و بن سێبەری بێژنگ بەسەری کەندێناوە هەڵێنا.. (مصطفی)ی باوکی وەك منداڵانی گوندەکەی یەکەم هەنگاوی ناردنی بۆ بەرخوێندن لە (حوجرە)ی مزگەوت بەگوێرەی خوێندنی ئەو کات دەست دەکات بەخوێندنی (سیپارەو احمدی) وهەندێ نامیلکەی تر لەبەر- ئەوەی توانای نوسین و خوێندنی لاواز بوو دەست دەکات بە (لەبەر کردن)ی ئەو دەرسانەی کەدەیخوێند وەك لەبەر کردنی (جزء عم وتبارك وقد سمع الله وسورەتی یاسین و یوسف...) هەندێکی تر.

زەمانەو نەبوونی ژیانی قورسی رۆژانەی خێزانی کوردەواری زۆرجار زاڵ دەبێ بەسەر حەزو ئارەزووەکانی مرۆڤدا.

بۆیە لەگوندی (لهێبان) بار دەکەن بەرەو گوندی (سەرگەران)ی کەندێناوە دەچن، کە هەموویان لەتیرەی (مامەسێن)ن، بەڵام دەروێش برایم لەتیرەی (ئەحمەد ئارکە)ی هۆزی (بلباسە) چەند ساڵێك دوای چوونیان بۆ گوندی (سەرگەران) حاجی مصطفی‌ی باوکی ساڵی ١٩٤٨ بەرەو سەفەری حەج بەرێ دەکەوێ و واجباتی حەج جێبەجێ دەکەن و لەگەڕانەوەیان لەوڵاتی عەرەبی (ئوردن) لەنێوان شاری (عمان واربت) بەکارەساتی ئۆتۆمبێل گیانی لەدەست دەدات و لەگۆڕستانی (اربت) بەخاك دەسپێردرێت دیارە بەنەگەڕانەوەی باوکی لەم سەفەرەو کارەساتە دڵتەزێنەدا زۆر کار لەم بنەماڵە دەکات بەتایبەتی (دروێش برایم) هەست و سۆزێکی وای دەکەوێتە دڵ شەوانە وەك شێت و شەیدا، لەخەڵوەت دادەنیشێت و بەحەیران و لاوکی پڕ غوربەت دڵی خۆی دەداتەوە، هەر ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە روو بکاتە حەیران و لاوکی ترو فێری یاساو رێساکانی بێت و سەربەندو دوابەندی



حەیران رێك بخات.

جگە لەوەش وەك باسمان کرد لەبنەماڵەیەکی ئاین پەروەربوون و خولیای بانگ و قامەتی نوێژو مزگەوت بوو هەر بۆیە لە (کەبار)ی بەیانیان و بانگ دان و تەسبیحاتدا خەڵکی گوێیان بۆ دەنگە بەسۆزەکەی رادەگرت و هەزار رەحمەتیان بۆ باوکی شەهیدی رێگای ماڵی خوا دەنارد...

دەروێش برایم هەستی کرد خەڵکانێك هەن گوێ بۆ بانگ و سەڵاو حەیران و بەستەدینی یەکانی رادەگرن وای نەکرد ئەم دەنگە بەسۆزە بەبێ سوود مەرگ لوولی بدات بۆیە لەتاقی لاویدا لەرێگای خودا بەکاری هێنا.

بەهۆی ئەوەی کەنزیك بوون لەو ناوچەی بەردەوام (دائیرەی دەروێشان) لەناوچەی قەراج و کەندێناوەو ناوچەکانی تر دەگەڕان لەسەر رێگای (طریقەتی شێخ عبدالکریمی بەرزنجی) ناسراو بە (شێخ عبدالکریمی دارە خورما) تۆبە دەکات و دەبێتە شەیدای خواپەرستی و وێڵی دنیای صۆفیاتی و خواناسین لەساڵی (١٩٤٩-١٩٥٠) دەبێتە دەروێش و رێگای خواپەرستی هەڵدەبژێرێ. ئەو سۆزو ئاوازەی کەخودا پێی دابوو لەخزمەتی دین و خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ و یارانی بەکاری دەهێنێ.

جگە لەوەی (دەروێش) ژیانێکی کوڵەمەرگی و دەردەسەری بەسەر دەبات بۆ پەیدا کردنی بژێوی ژیانی چەندین ناوچەکانی خۆشناوەتی مرکێ و ئەوبەری زێ و ناو عارەبان و قەراج و کەندێناوە دەگەڕێ بەکاروان و کەسایەتی و شارەزای سەرجەم ناوچەکان دەبێت.. لەساڵی ١٩٦٥ دوای ئەوەی ئیش و کاری جوتیاری نەهات و کەم دەبێت بەهۆی ناوبانگی و دەنگە خۆشەکەی لەمزگەوتی (حاجی بەکر زێرینگەر) لەهەولێر بەبانگدەر (مؤذن) دادەمەزرێت لەساڵی ١٩٦٧ دەگوازرێتەوە بۆ مزگەوتی (حاجی قەرۆك) لە ئیسکان و بەبانگدەر تاکو ئێستاش لەم مزگەوتە خزمەتی دین دەکات. جگە لەوەش تاکو ئێستا بەسەدان مردووی موسڵمانی شۆریوە.

## ژیانی هونەری

دەروێش برایم هەر چەندە نەخوێندەوارە سەرەتاوەك باسمان کرد بەڵام دوای وەرگرتنی تەریقەت واز لەحەیرانی پڕ سۆزی دڵداری دەهێنێ و زەوقی خۆی دەداتە حەیرانی ئاینی و پیاهەڵدانی پێغەمبەر ﷺ ویارەکانی و پیاوچاکان سەرەڕای زانین و دانانی چەندین حەیران و لەبەرکردنی زیاتر لە (٦٠) شیعری شاعیرانی وەك (تاهیر بەگی جاف و صافی هیرانی و بێخودو ناری و جزیری و شێخ نورالدین و شیرازی و مەولەوی و حسن شنۆیی و مەلا عاصی و ....هتد) سەرەڕای ئەوەی دەفژەنێکی باشیشە. هەر چەندە نەخوێندەوار بووە، بەڵام بۆ لەبەر کردنی شیعر بەیەکێك چەند جاری دەخوێندەوە لەبەر ئەوەی زەینی زۆر روون بوو لەبەری دەکرد (یەکێك لەخوێندەوارانی گوند گێڕایەوە: جارێك لەکاتی خوێندنەوەی یەکێك لەئایەتەکانی (جزء عم) بۆ دەروێش برایم لەبسم الله دەستم پێ کرد تاکۆتایی سورەتەکە بۆ جاری دووەم کەبۆم خوێندەوە وشەیەکم لەبیر چوو بۆی بخوێنمەوە: گوتی راوەستە بۆ پێشتر لەو نێوانەدا وشەیەك هەبوو کەبۆم خوێندەوەگوتی ئێستا تەواوە) سەرەڕای ئەمانەش چەندین قەسیدەی عەرەبی لەبەرکردووە. هەروەها داستانەکانی (زەمیل فرۆش و لاوکی گەنج خلیل)و هەندێکی تری لەبەر کردووە دەروێش جارێکیان گوتی: وەك دێتە بیرم یەکەم شیعر لەبەرم کرد بێ شیعری (حسن شنۆیی)یە لەسەر مەدحی پێغەمبەر ﷺ کەدەڵێ:

**چونکە ئەمرۆم یار نەدیوە دڵ دەکاتن شیوەنێ**
**جەرگ و دڵ وابۆی دەسوتێ هەروەکو دارە بەنێ**

## (نهێنییەکانی ناخ)

* دەروێش برایم لایەنی سیاسی و ئاینی تێکەڵ بەدەنگی زوڵاڵی دەف کردووەو هاوکات شیعری شێخ لطیف شێخ محمودی لەبەرکردوە کەبەبۆنەی کۆچی دوایی (شێخ مەحمود نەمر) کە لەزۆربەی بۆنەو (مەولود)ی پێغەمبەردا ﷺ ئامادەبوانی شوێنەکە داوایان لێ کردوە کەبۆیان بڵێ، ئەویش لەهەموو سات و سەردەمێك دڵی ئەو میوانانەی نەدەشکاند کەبۆ مەولود هاتبون، بۆیە دەستی دەدایە دەفەکەی و لەدڵ و دەروونەوە وەك کوردێکی جەرگ سوتاو زوڵم لێ کراو لەناوەڕاستی شیعرەکە وەك بلبل دەیچریکاند و دەیگوت:

**وەتەن هاوار دەکا بۆ کورد**



دەڵێ سەرداری کوردم رۆ

سەرۆکی کوردو کوردستان

بزورگێکی نەبەردم رۆ

لەبەشێکی تری پارچە شیعرەکەشدا دەیگوت:-

ئەوەی کوردە لەدونیادا

هەمووی ئەمرۆ واغەمناکە

لەعێراق و لەئێرانا

هەتا سوریا تەماشاکە

بەهەوری ماتەم گیراوە

لەبێ خاوەنی ئەم خاکە

سلێمانی بەیەك ئاواز

بڵێن سەرداری کوردم رۆ

* لەسالی ١٩٧٩ دوای کۆچی دوایی سەرکردەی مەزنی کورد (بارزانی نەمر) وەك هەموو کوردێکی دڵسۆز هەوری ماتەم سێبەری خستە سەر دڵو دەروونی ئەویش هەر یەکەو بەجۆرێك ماتەمینی داگرت ئەو زۆری خەم خوارد زۆرشەو بوو لەبەر دالغە خەوی لەچاوان دەتۆراو لەبەرخۆیەوە (شیعر) دەخوێندەوە چەند رستەیەکی دەگوت وەك یەکێك ئازیزترین کەسی لێ مردبێ دەستی دەکرد بەگریانو لەژوورەوەی جەستەیدا دەکولا، کاتێك لێی نزیك دەبویەوە هەستت دەکرد کەئەم پارچە شیعرەی بەئاواز دەگوت،

وەتەن هاوار دەکا بۆ کورد... تا دەگەیشتە:

(بەهەوری ماتەم گیراوە

لەبێ خاوەنی ئەم خاکە)

خۆی بۆ نەدەگیراو ریز ریز فرمێسکی غەریبی بۆ گەلی کوردو باوکی ئەمر (بارزانی نەمر)مان دەرشت، کاتێك لەبۆنەکانو مولودا ئەم شیعرانەی دەگوت سەرنجی زۆر کەسی رادەکێشا تا وای لێ هات لەلایەن دەزگاکانی رژێم ئەمەی لێ قەدەغەکرا.

* لەژیانیدا زۆر شەیدای ئەوە بوو تەنها جارێك سەفەری مالی خوا بکاتو بەخزمەت (بیت الله) ومالی (رسول الله) بگات بۆیە لەحەیرانەکانیدا بەسەر ئەو سەفەرەدا دەڵێ: کە ئەمە دەقی حەیرانەکەیە:

((خۆزگە گۆرەك بام لەگۆرێ ئەورۆژێ شێن ببام لەسەر کێوی عەرەفات رۆژی عارفەی وەکی خێوەتێ حاجیان هەردەدا لەو مەقامی عەرەفات لەناو غوبارو تۆزی، ئەی گەلی موسڵمانان دەیاڵلا بەعام بچینە خزمەتی شاهی مەدینەی ئەحمەدی موختار لەوێ لەگەر عەزیزو خۆشەویستان بکەین جەژنە لەگەر پیرۆزێ.- بابی خۆمو دەروێشان مردم هەندێ ئاخت بۆ هەرێنم، ئەو رۆ بەوێ پایزێ نەخۆشەکی گە لەگرانم، لەبۆ رەزامەندی خودای کەرەم کەدەمەکی وەرەسەرینم، ئەی گەلی موسڵمانان باهەرگرین دەفەو عەلەمان تەپریو بەیداغان شۆر ببینەوە لۆ شاری مەدینەی لەخزمەت حەزرەتی رەسوڵلا عەزیزو خۆشەویستان ببینم)).

هەر ئەوە بوو خولیای تەنها جارێك زیارەت بوو بۆیە لەسالی ١٩٩٠ خوا بۆی رێك خستو سەردانی حەجی کردوو بوو بە (حاجی دەروێش برایم)و ئەم ئاواتەی هاتەدی.

* جگە لەوانە چەندین حەیرانو لاوکی تر دەزانێو لە بۆنەکان دەیلێتەوە لەوانە لەسەلاوات لێدان زۆر مشهور بوو وەك کە دەڵێ:-

- لەمەدینەی منەوەرە ئاقە گۆرەك پێغەمبەرە (محمد)

شافیعی رۆژی مەحشەرە سەیدی عالەم سەلاوات.

- یا محمد هەم سەیدی هەم سەرومەری

شافیعی رۆژی مەحشەری جوبرائیل بوو بەرەهبەری

یا محمد لە پێش عالەم ئەتوو نور بووی

لەنووری پادشای غەفوور بوو

ئەوەلو ئاخر مەشهور بووی

ئەزمر بکە ئەی شاهی من

بەرسینەیە بۆ ریانی من

کەرەم بکە دەرمانی من

بەرفەخری عالەم سەلاوات.







# ئاییـــن و شارستانیەت

ئا: بەختیار سەعید سالح

ئادەمیزاد، ئەو کائینە سەر سوڕهێنەرەیە کەئەرکی ئاوەدان کردنەوەی سەر زەوی پێ سپێردراوە هاوکات لەگەڵ ئەو ئەرکە گەورەیەشدا پێویستی یەکانی جێ بەجێ کردنیشی یان راستەخۆو بێ دەست تێوەردانی خۆی بۆ دەستەبەرکراوە ئالەم رووەوە دەتوانین بڵێین پەروەردگار لەگەڵ پێسپاردنی ئەرکی ئاوەدان کردنەوەدا دەستی لەم مرۆڤەی خۆی بەرنەداوەو هاوکات هاوکاریشی کردوە بۆناسنانەی شتەکانی سەر ئەم هەسارەیە.

لەبەر ئەوەی پێویستی دەبێت بەهەریەکە لەو شتانەی کەوەك تاك یان كۆ لەم هەسارەیەدا دەبینرێ هەڵبەتە فێریشی کردوەو ئاشنایەتی زیاتریشی پێ بەخشیوە ﴿وعلم أدم الاسماء کلها﴾ ئالێرەوە باسەکەمان سەرهەڵدەدات کەئەویش شارستانیەتە کەئەمڕۆ بەشێوەیەکی پڕبایەخ باسی لێوە دەکرێت کەبریتییە لە پراکتیزەکردنی تێگەیشتە جۆراو جۆرەکانی کۆمەڵگا بۆ هەموو دیاردەو شێوازەکانی ژیان بەرهەمی سەرجەم رۆشنبیری نەتەوە لەقۆناغی نیشتەجێ بوون و بنیاتنانی شارو شوێنە ئاوەدانە فراوانەکان ئەمانەو کۆی هەموو ئەزموون و تێگەیشتن و بیروباوەڕە تاکەکانیش سیستمێکی بەکۆمەڵی بۆ گشت دانیشتوانی ئەو شارو ئاوەدانیانە دروست کردوە هەڵبەتە ئاینی پیرۆزی ئیسلام و بگرە ئاینەکانی تری ئاسمانیش تەئکیدیان لەسەر ئەوە کردۆتەوە کەمرۆڤ وجوودو بوو نەوەرێکی بەمەبەست دروست کراوەو خوای گەورە بۆ ئاوەدان کردنەوەو پەرستنی خۆی دروستی کردووە. کەرەستەکانی ئەو ئاوەدان کردنەوەیەش عەقڵێتی بنیاتنانی (شارستانیەت)ی لەقۆناغی پێگەیشتن و کامڵ بووونیدا پێ دراوەو دەدرێ.

دوای بڕینی قۆناغەکانی مێژووی ژیانی تاك پاشان جووت و دواتر خێزان و بنەماڵەو گەل و نەتەوە، ئابەم جۆرە شارستانیەتەکانیش یەك لەدوای یەك پەیدابوون هەڵبەت لەم سۆنگەیەوە زورباش دەتوانین رۆڵ و ئەهەمیەتی ئاین هەڵبەسەنگێنین لەهێنانەکایەو بنیات نانی شارستانییەتەکان و بزانین بە چ شێوەیەك رێگایان بۆ ئەو دیاردە مرۆڤایەتی‌یە سازو خۆش کردوە بەو جۆرەی کەخۆی کردۆتە یەکێك لە پایە بەهێزەکانی.

ئاین وەك چوارچێوەی یان سەرچاوەیەك بۆ تێگەیشتن و بۆ چوونەکانی مرۆڤ بەپێی پابەندیی پێیەوەو شارستانیەتیش وەك پراکتیزەکردنی ئەو تێگەیشتن و بۆچوونانە لەسلوك و رەفتارو نەریتی ئەو گەل نەتەوە خاوەن ئاین و شارستانیەتانەدا ئەو راستی‌یە دەسەلمێنن، کەنەك هەر پەیوەندی توندو تۆڵ هەیە لەنێوان ئاین و شارستانیەتەکانی‌دا، بەڵکو ئاین سەرچاوەی (یەکەی) شارستانیەتەکان بووە. بەو واتایەی کەئاین هەمیشە ئامادەیی هەیەو هەبووە لەژیانی مرۆڤدا. چونکە قۆناغێکی ژیانی بێ ئاینی لەمێژووی مرۆڤ یەتیدا نەبینراوە ئەگەر گوتمان (خوانەکرد) ئاینێکی دروست کراویش بوو بێت کەواتە شارستانیەت بەرهەمی کۆمەڵێ نەریت تێگەیشتن و ئەندێشەی ئەو گەل و نەتەوەیەیە کەشارستانیەتەکەی بنیات ناوە، ئەوا تێگەیشتن و رۆشنبیریی ئەو گەل نەتەوەیەش لەروانگەی ئەو ئاینەوە بووە کەخۆیان بەهەڵگری زانیوەو زۆربەی ئاراستەکانیان لەوەوە وەرگرتووەو لەمومارەسەی ژیانی رۆژانەیاندا جێبەجێ کردوە، شتێکی بەڵگەنەویستە هەمیشە ئەم کاریگەرییەش بەپێی پابەندیی و هۆگری ئەو گەل و نەتەوەیە بووە بەئاینەکەیەوە، عەقیدەو بیروباوەڕی ئایینی سەرچاوەی زۆربەی بۆ چوون و تێگەیشتنە جۆراو جۆرەکانی مرۆڤ بووە دەربارەی بوونەوەرو ژیان و کۆمەڵگەو هەر لەو روانگەیەوە پەیوەندی‌یە کردەیی‌یەکانی خۆیان لەگەڵ یەکترو سروشت و دەوروبەردا رێك خستووە کەواتە سەرجەم ئەو بۆچوون و دەستەواژانە یەکانگیر دەبن لەگەڵ ئاینی ئیسلامی پیرۆزیشدا سەبارەت بەدەوری بنەرەتی ئاین لەشارستانیەتدا، ئیسلام بۆ خۆی لەجوڵانەوەیەکی بەردەوامدایە بەمەبەستی گۆڕینی زاتی مرۆڤەوە بۆ ئەوەی بتوانێت بەقەناعەتەوە هەموو ئەرکەکانی جێبەجێ بکات و خۆشی چێژ لەجێبەجێکردنی ئەو ئەرك و رێنموونی‌یانە وەربگرێ، لەم درێژەدادانەی باباسەکەماندا مرۆ دەگاتە ئەو هەقیقەتەی کەیەکێك لەپایە بەهێزەکانی شارستانیەتی ئیسلامی ئەو هاوسەنگی‌یەیەکە لەنێوان (رۆح و ماددە)و (دنیاو ئاخیرەت)دا دروستی کردووەو بگرە لەناو یەکدا

توانەتەوە بەجۆرێك ئامانج و هۆکارەکانی لەناو ئەم شارستانیەتەدا زۆر بەروونی دیاری کراوەو تەمو مژی تیانە میشتۆتەوە، مرۆڤی ناو شارستانیەتی ئیسلامیش دەزانێت بۆچی دروست بووەو پاشە رۆژی بەکوێ دەگات کاتێك ئاگادارکراوەتەوە کە کارو ئەرکی لەژیاندا پەرستنە ﴿وماخلقت الجن والانس الاليعبدون﴾ (الذاريات- ٥٦)

لەبەرئەوە رۆڵی ئایینی لەم مامەڵەو کاردانەوانە وا ون دەبێت و پاشان والەناخماندا دەچەسپێت کە رۆشنبیری و شارستانیەتی رۆژئاوا خاوەنی هیچ ئاینێك نەبوون ئەوانەی کەئەمڕۆ ئاینیان پێ قبول نییە ئەم بارودۆخە دەقۆزنەوەو زیاتر مەسەلەکان ئاوەژوو دەکەنەوە بۆ کەم کردنەوەی رۆڵی ئایین بەکاری دەهێنن، جوانترین نموونەش ئەورووپایە کەشارستانیەتی بۆ بنیات نەنرا، تامەسیحیەتی پێ گەیشت ئەمەش لەوانەیە جێگای سەرسوورمان بێت .. بەڵام هەموو لێکۆڵەرەوەکانی مێژووی شارستانیەتی ئەورووپی دان بەو راستییە دادەنێت، کە ئایین رۆڵی هەرەگرنگ و بنەڕەتی هەیە لەدامەزراندنی شارستانیەتدا.

# زانکۆو مزگەوتو ئارامگەکانی ئایینی

## کەنعان بریفکانی

ویست و فەرمانەکانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام هەردەم لەگەڵ ئەوەدا بووە کە مرۆڤ خولیای زانست و زانیاری بێ. هەر بۆ ئەمەش پێغەمبەری مەزن فەرموویەتی(اطلب العلم من المهد الى اللحد) یان(طلب العلم فريضة على كل مسلم ومسلمة) وەیان(اطلب العلم ولو في الصين).

هەر بۆ ئەمە شتێکی زۆر گرنگ پێویستە، کە مرۆڤ هەوڵی دامەزراندنی قوتابخانەو خوێندن بدات، کە سەرەتا بنچینەکەی لەسەر قورئان بێ، ئنجا وتە بەنرخەکانی پێغەمبەری خۆشەویستمان (+) شرۆڤە بکرێن.کە ئەو دوو بنەمایە، دروست کەرو ژیاندنەوەی کۆمەڵگەیە.. سەرەتای مێژووی خوێندن لەمزگەوتەکان دەستی پێکرد، کە زانستی ئیسلامی تێدا دەخوێنرا، جا هەر بۆ ئەمە کورتە زانیارییەك دادەڕێژین لەبارەی زانکۆکانی سەردەمی خەلیفەو والی و سەرکردەکان.

زانکۆی بەسرەی گەورە کە لەساڵی ١٦ ك واتە ٦٣٠ز دامەزرا لە سەردەمەی سەرکردەی بەناوبانگ (عوتبەی کوڕی غەزوان)، ئنجا ساڵی ٤٤ك نوێ کرایەوە، لەسەر دەستی (زیادی کوڕی ئەبیە)، کاربەدەستی خەلیفە معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان بوو. ئەو زانکۆیە مزگەوتێکی گەورە بوو کە بەهەزارەها خەڵکی ئەم ناوچەیە سوودیان لێ وەرگرتبوو کەچەندەها زانستی هەمە جۆری تێدا دەخوێندرا- وەکو زیکرو ئاداب و زمان و ئەدەب و رۆشنبیری گشتی، کەچەندەها زانای گەورەی پێگەیاندووە.

هەر بەماوەی سێ ساڵ پاش دامەزراندنی زانکۆی بەسرە، مزگەوتێکی گەورە لە کوفە دامەزرا، کە بوو بە بنکەی زانست و رۆشنبیری و چالاکی هەمە جۆر، کە هیچ جۆرە زانکۆو مزگەوتی ئەوکات نەیدەتوانی شان بە شانی زانکۆی کوفە بووەستێ لەسەدەی یەکەمی کۆچی جگە زانکۆی بەسرە نەبێ، کە کوفە چەندەها بەشی خوێندنی لێ کرایەوە وەك بەشی ژیانناسی ئایینی و شارستانی و رامیاری.

ئەمەو لەسەردەمی عەباسییەکانیشدا بووکە زانکۆی موستەنسریە لە بەغدا دامەزرا، هەروەها لەسەر دەستی نیزام مەلیك دامەزرا، کە وەزیری ئەرسەلان سەلجوقی بوو لەکاتی فەرمانڕەوایی قائم بامر الله.

قوتابخانەی نوعمانیەی دامەزراند لەساڵی(١٠٣١ کۆچی ١٠٧٥ زایینی)، کە هاوکات ئێستا ئەو مزگەوتەیە کەمەرقەدی پیرۆزی ئیمام ئەبی حەنیفەی نوعمانی تێدایە.

سەرکردەی ئایینی ومێژوویی میسری (جەوهەر سەقلی) شاری قاهیرەی دامەزراندو کردی بەپایتەختی خەلیفەی فاتمییەکان، کەزانکۆیەکی گەورەی لەو شارەدا دامەزراند بەناوی(الازهر) لەساڵی ٣٦٠ك. پاشان سەردەم بەسەردەم رووبەرو شێوەی مزگەوتەکە لەگۆڕان دابوو تابووبە ئەو زانکۆیەی کە بەگەورەترین زانکۆ لەجیهاندا ناوزەد کراوە، کە ئێستا بە گەورەترین سەرچاوەی زانیاری و زانست و خوێ،دنی ئیسلامیە خەڵك لەهەر هەموو جیهاندا رووی تێ دەکەن.

لە وڵاتی مەغریب، شاری فاس بەشاری زانست ناو زەد کرا، کە بەدەیەها قوتابخانەو زانکۆی گەورەی تێدایە. لەساڵی (٢٤٥ك- ٨٠٩ز) مزگەوتی (قورەوەین) چەند گەورە زانایەك، ئەو زانکۆیەیان پێك هێناو دروستیان کرد کە چەندەها پیاوی ئایینی و قازی و وەعزدەری تێدا تەخەروجی کردو بڕوانامەی ئایینی پێدرا.



# مەزارگەی ئیمامی حوسەین رضي الله عنه

بروا فاتح خۆشناو

هەڵبەت رۆژی عاشورا واتە (١٠)ی مانگی موحەڕڕەم پڕە لەزۆر رووداوی مێژوویی و بەسەرهاتی گرنگی پێغەمبەران (سڵاوی خوایان لەسەر بێت) بۆیە جێی خۆیەتی لەم نووسراوە داو بەم بۆنەیەوە ئاماژەیە بۆ چەند رووداوێکی مێژوویی و بەسەرهات بدەین و، بیخەینەوە بیر موسڵمانانی کورد، تا زیاتر ئاشنای رووداوو بەسەرهاتەکانی ئەم رۆژە پیرۆزەی (عاشورا)بین.. بەڵێ...!

لە (١٠)ی مانگی موحەڕڕەم حەزرەتی (ئادەم)عليه السلام بەری دارەکەی لەبەهەشت خواردو هەر لەهەمان رۆژیشدا خوای گەورە پارانەوەکەی گیراکردووە.. لەم رۆژەدا کەشتیەکەی حەزرەتی (نوح) سەلامی خوای لەسەر بێت لەتۆفان نەجاتی بووە.. هەر لەم رۆژەدا خوای گەورە شیفای حەزرەتی ئەییوبی لەنەخۆشیەکەی داوە.. لەم رۆژەشدت بوو حەزرەتی زەکریا لەناودار شەق کرا، ئەمەو چەندین و چەندین بەسەرهاتی دیکەش هەن، بەڵام لێرەداو لەم نووسراوە ناتوانین بەدرێژی بچینە ناو پیرۆزی و گەورەیی ئەم رۆژەو بەسەرهاتەکانی. بەڵکو ئەوەی ئێمە لێرەدا مەبەستمانە ئەوەیە تیشکێك بخەینە سەر مەزارگەی ئیمامی حوسێن رضي الله عنه..

(ئیمامی حوسەین کوڕی ئیمامی عەلی کوڕی ئەبی تالیب)ە، لەرۆژی هەینی و (عاشورا)، واتە لەرۆژی (١٠)ی مانگی موحەڕڕەمی ساڵی (٦١)ی کۆچی لەشوێنێك بە ناوی (الطف) کەشاری (کەربەلا)ی ئێستاکەیە لەخاکی عێراق شەهید کرا. ئەمەو جەستە پیرۆزەکەشی هەر لە (الطف) کە کەوتۆتە لای رووباری (کەربەلا) نێژراوە.. (تەبەری ) لەکتێبەکەیدا ئاماژەی بەم رووداوە کردووەو دەڵێت: (شوێنی کوشتنەکەیان ون کردووە بۆ ئەوەی کەس بەشێوەیەکی دیاریکراو بەهەواڵ و شوێنی کوژرانەکەی نەزانێت بەڵام سەرەپیرۆزەکەیان هەڵی گرتووەو بردوویانە بۆ (عوبێدولای کوڕی زیاد) لەکوفە. جاجیاوازی نێوان زانایان ئالێرەدا سەبارەت بەم کوژرانە دەست پێدەکات، بەوەی کەئایا (یەزیدی کوڕی معاویە) لەشام ئەمەی وەرگرتووە یان نا.. ؟! گێڕاوەیەکی دیکەش هەیەو دەڵێت: (یەزید) سەرەپیرۆزەکەی ئیمامی (حوسەین)ی رضي الله عنه ناردووە بۆ (عەمری کوڕی سەعید)ی جێگری شار. (عەمر)یش سەرە پیرۆزەکەی لەتەنیشت (فاتیمەی زەهرا)ی دایکی لەگۆڕەستانی (بەقیع) ناشتووە.. سەرەڕای ئەمەش باسێکی دیکەش هەیەو دەڵێت: (یەزیدی کوڕی معاویە) سەرەکەی لەناو ئەمبارێك داناوەو

هەڵبەت پاش مردنی ئەویش سەرەکە بەئەمبارەوە لەناو دەرگای (فەرادیس) لەشاری دیمەشق نێژراوەو شوێنەکەش بەمزگەوتی (سەر) ناوبراوە، هەروەها دیسان دەڵێن (یەزید) (٣) رۆژ سەرەکەی لەدیمەشق هێشتۆتەوەو پاشان لەناو ئەمبارێکی چەك دایناوە تا زەمانی (سلێمانی کوڕی عەبدولمەلیك هەڵبەت (سلێمان)یش سەرەپیرۆزەکەی دەرهێناوەو کفن و بۆن خۆشی کردووە، پاشان نوێژی لەسەر کردووەو لەگۆڕەستانی موسڵمانانی ناشتووە.. کەعەبباسیەکانیش هاتوون سەرەکەیان دزیوەو لەگەڵ خۆیاندا بردویانە. بەڵێ (ئیبن کەثیر) لەگێڕانەوەی ئەم هەواڵەیدا دەری نەخستووە کە ئایا (ئیبن عەساکر) لەکوێی ناشتووە.

هەروەها (ئیبن کەثیر) دەڵێت (کۆمەڵێك موسڵمان بەناوی (فاتیمیەکان) گوتیان سەرە پیرۆزەکەی (حوسەین) رضي الله عنه گەیشتۆتە میسرو هەر لەوێ بەخاك سپێردراوەو مەزارگەیەکی گەورەو ناوداریشیان لەسەر ئەم شوێنەو لەمیسر دامەزراندووە لەهەمان کاتدا زانایان بە دەقی جۆراو جۆر ئەم هەواڵەی (فاتیمیەکان) بەنادروست لەقەڵەم دەدەن و دەڵێن (فاتیمیەکان )تەنیا ویستوویەتیان نەسەبی ئەم بنەماڵەیە بگوزانەوە میسر ئابەم شێوەیە راو بۆچوونی جیاوازی زانایانمان کە تایبەت بوو بەسەرەپیرۆزەکەی (ئیمامی حوسەین) رضي الله عنه و مەزارگەکەی خستەروو بەو هیوایەی لەرووی مێژووەوە سوودێکمان گەیاند بێت..

سەرچاوە: ژمارە (١٥١)ی گۆڤاری (العربی) ساڵی ١٩٧١.





# بنیات نانی (ئەزهەر) لەرەمەزاندا بووەو بووەتە گرنگترین زانکۆی ئیسلامی

ماهر مستەفا مزوری

رزگاركردنی میسر لەسەردەستی فاطمی‌یەكان كاریگەری گەورەی خۆی هەبوو لەهەردوو لایەنی ئاوەدان كردنەوەو رۆشنبیری. لەلایەنی ئاوەدان كردنەوە هونەرو بینات نان بوژایەوە ئەمەش بە روونی دیار دەكەوێت لەدروست كردنی ژمارەیەك مزگەوتی دڵ رفێن كەتا ئەمرۆش بەجوانی و رێكو پێكی ماون. زانكۆی ئەزهەر بەكۆنترین زانكۆكانی جیهانی ئیسلامی دەژمێردرێت وشەی ئەزهەر لە (زهراء) وەرگیراوە ئەمەش ناوناوی (فاطمە)ی كچی پێغەمبەرە ﷺ وەخێزانی میری موسولمانان (عەلی كوڕی ئەبی تالب ر.خ) كەفاطمی‌یەكان بانگێشەی خۆیان دەگێڕنەوە بۆ ئەو. زانكۆی ئەزهەر وای لێ هات بووە بەناو بانگترین زانكۆی ئایینی لە جیهانی ئیسلامی‌دا، هەزار ساڵ پێش ئێستا دروست كراوە تا ئێستا كاری فێركردنی خۆی لەدەست نەداوە، واتە فێركردنی ئایینی. زۆر جارانیش لەكاتە جیاجیاكاندا كاری چاك كردنەوەو نۆژەن كردنەوەی بەخۆوە بینیوە، وەگرنگترین خەسڵەتی ئەزهەر ئەوەیە كەسێ گومبەتی هەیە لەسەر دیواری قیبلە. زانكۆی ئەزهەر یەكەمین مزگەوتی زانكۆیی‌یە كە لەشاری قاهیرە دامەزراوەو ناسراو بوو بەزانكۆی قاهیرە. لەسەردەمی فاطمی‌یەكان بەدەستی سەركردەی فاطمی (جوهر الصقلی) والی میسر لەمانگی رەمەزانی ساڵی (٣٦١)هـ (٦٧١)م دروست كراوەو كارتیایدا تەواو بووەو لەهەمانكاتدا بەگرنگترین مزگەوت دەژمێردرێت، شیاوی ئاماژە پێكردنە چۆنیەتی بنیاتنان‌و نەخشە كێشراوەكانی تا ئێستا بەڕوون‌و ئاشكرایی دیارە.

جوانی خۆیانیان لەدەست نەداوە، چونكە لەكاتە جیاجیاكانی‌دا كاری نۆژەن كردنەوەی پێویست بۆ كراوەو چەندبەشێكی گرنگی بۆ زیاد كراوە بەبێ ئەوەی زیان بەئەركە سەرەكەیەكەی بگەیەنێت وەك جێگایەكی پەرستن. لەسەردەمی دەسەلاتداری (سەلاح الدین ئەیوبی) پشت گوێ خرا بۆ ماوەی سەد ساڵ. ئەزهەر پلەو پایەی خۆی بەدەست هێناوەو لەسەردەمی پادشاكان بوو بەزانكۆیێكی گەورە، ئەوە بوو سوڵتانی (بیبەرس) هەستا بەنوێ كردنەوەی‌و توانی پلەو پایەی زانستی خۆی بۆ بگەڕێنێتەوە لەنێوان هەموو مزگەوتەكانی قاهیرەدا.

مزگەوتەكە زەوی‌یەكی شێوە لاكێشەیی داگیر كردووە كە درێژیەكەی (٨٨م)و پانی یەكەی (٧٠م)ە، درێژی شوێنی نوێژكردن (٨٥م) پانی‌یەكەی (٢٥م)ە، كەهاوسەنگە لەگەڵ دیواری قیبلەوپێنج دینگەی بەخووە گرتووە كەپانی هەریەكەیان (٥ر٤م)ە، تەنیا لەسەر دینگەی میحراب سێ گومبەتی هەیە وەدینەگەكانیش دابەش دەكرین بۆ (١٩) بەش، جێگای نوێژكردنیش دەڕوانێتە بازنەی ناوەوەی رووبەڕووبووەكان كەلە (١٣كەوانە) پێك هاتووە، پانی نێوان ئەستۆنەكانی بەشەكان نزیكەی (٤م)ە، بێجگە لەبەستی میحرابەكە كەزۆر فراوانەو پانی‌یەكەی دەگەیشتە (٧م) نەخشەكێشانی بازنەی مزگەوتەكە شێوە لاكێشەیی‌یە كەنووساوە بەشوێنی نوێژكردن، درێژی‌یەكەی (٥٩م)و پانی‌یەكەی (٤٣م)ە لەلاتەنیشتەكانی دوو هۆڵ هەبوون لەناو هەریەك لەهۆڵەكان سێ بەش هەبوون كەهاوتەریب بوون لەگەڵ بازنەكە (صحن) پێشەكەی هەریەكەیان لە (١١) كەوانە پێك دێت لەهەریەك لە بەشەكانی هۆڵەكە(١٠) ریز كەوانە هەبوو كەهاوتەریب بوون لەگەڵ ریزەكانی شوێنی نوێژكردن،



لەهەریەکەیان سێ کەوانە هەبوو ئەم سەرو ئەوسەری بەشەکانی دەبڕی. لەهەر چوار لاکانی مزگەوتەکە بەشێکی تری بۆ زیاد کرا کەبەچوار دەوری بازنەکەدا دەسوڕێتەو دەوری داوە. چونکە پێشتر مزگەوتەکە پاشەبەشی نەبوو (بهو مؤخر) کەناوەراستی بەشەکەی نووساوە بەشوێنی نوێژکـردن تابێتــە شـوێنی چوونـــە ژوورەوە کـــە لەسەرویەوە گومبەتێك هەیە لەم لاو ئەو لاش دوو میحراب هەن یەکێکیان لەلای چەپو ئەوی تریان لەلای راستە، وەئـەم بەشـەش دەروانێتـە بازنــەی نـاوەوەی بەچـەند کەوانەیەك کە لەسەرجووت ستوونی دانراون ،مزگەوتەکە سێ دەرگای هەبوو، یەکێکیان لەناوەراستی دیواری چەپ بەرامبەر بەمیحرابەکەو دووانیش بەش کراون بەسەر دیوارەکانی رۆژهەلاتی و رۆژئاوای. هەروەها مزگەوتەکە (١٣) میحرابی هەیە، ئێستا تەنها شەشیان ماون، ئەم میحرابانـەش لـەجوانی وردەکـاری جیاوازیـان هەیــە، کۆنترینیـان میحرابێـك کەلـە ناوەراسـتی دیـواری قیبلـەدا بووپێـش روخـاندنی، میحرابێکـی نـاو بـوش بـوو لەکەوانەیەك پێك هاتووە، کەنیوە گومبەتێکی لەسەر هەیە کەبەچـەند نەخشـەو نیگـارێك رازاوەتـەوە، لـەپێش کەوانەیـەکی نـوك تیـژ هەیـە کەهـەردوو لای لەسـەر دوو ئەسـتون دانـراون دوو ئەسـتۆنە کەشـی کەوتوونەتـە میحرابەکـە گومبـەتی (حـافظ) تـا ئێسـتاماوەو کەوتوتـە ناوەراسـتی بەشـەکەیو دەروانێتـە بازنـەی جێگـای نوێژکردن، بنکەی ئەم گومبەتە شێوە چوار گۆشـەییە هێلەکـەی (٥ر٣م)ە بـەرزایی گومبەتەکـەش (١٣م)ە لەسـەر رووی رووبەری شوێنی نوێژکردنەکە. دیوارەکانی شوێنی نوێژکردن رازاوەتەوە بەنەخشو تابلۆی گەچی زور جوانو زۆربەی نەخشەکان رووەکینولەگەڵ وێنەی مێوەجات چوار دەوری ئەم تابلۆیانەش بەنەخش چوار دەورە دراوە، ئەم نەخشـانەش بریتـین لەچـەند ئایـەتێکی قورئـانی پـیرۆز بەخـەتی کوفـی نووسـراوە، لەسـەر گومبـەتی هولەکـەش بەچەند تابلۆیەکی گولی کێشراوە بەخەتی کوفی کراوە. هەرچی رووی جێگای نوێژکردنەکەشە دەروانێتە بازنەی ناوەوەی لەشێوەی کەوانەدان کەسەری نوك تیژی هەیـە، وەدیوارەکانی کەوتۆنەتە سەر رووی رووەکـانی بازنەکـە، لەنێوان ناوەوەی لەشێوەی کەوانەدان کەسەری نوك تیژی هەیـەو وەدیوارەکـانی کەوتوونەتـە سـەرووی رووەکـانی بازنەکـە، لـەنێوان رۆخـەکانی گرێیـەکان رازاندراوەتـەوە بەچەند قەوسێکی بێ خوست (صماء) لەشێوەی میحراب کـەچوار دەورە دراوە بەخـەتی کوفـی. دوو قوتابخانـەش زیاد کراوە بۆ بیناکانی زانکۆی ئەزهەر یەکێکیان کەوتوتە لای راسـتی نـاوەوەی لـەلای دەرگـای چـەپی کەلەسـالّی (٧٠٩ك)، (١٣١٠ز) دروسـت کـراوە، دووەمیـش کەوتۆتـەلای چەپی ناوەوەی ئەم دەرگایەوە، لەسالّی (٧٣٩ك)، (١٣٣٩ز) دروسـت کـراوە لەسـالّی (٨٤٤ك)، (١٤٤١ز) سـێیەم قوتابخانـەی بـۆ زیـاد کـرا. لەسالّی (٨٠٠ك)، ((١٣٨٩ز) منارەی مزگەوتەکە تێك درا لەبەرکورتی دوایی لەشوێنی ئەو منارەیەکی تر دروست کرا بەلاّم ئەویش تێك دراو دووبارە لەنوێیـەوە دروسـت کرایـەوە لەسـالّی (٨٧٣ك)، (١٤٤٦ز) دووەم منـارە بـۆ مزگەوتـە کـە لەتەنیشـت دەرگـای دەریـایی لەسەردەمی سولّتان (قانصوه الخوری) منارەیەکی تریش بۆ دروست کرا، وەلەسەردەمی دەسەلاّتداری میسر (عبدالرحمن کشـخدا) کەیەکێکـە لەهەرگـەورەی میرەکـانی مەمالیکـەکان سێ منـارەی تریشـی بـۆی دروسـت کـرا، کـۆی منارەکـان گەیشتە شەش منارە، ئێستا مزگەوتەکە چوار منارەی جۆراو جـۆری هەیـە کەهەریەکـەیان بـەجۆرە نەخشـێك رازاوەتـەوە، چونکـە ئـەم منارانـە لـەچاخی جیاجیـا دروسـت کـراون. وەلەسـەردەمی والی یـەکانی میسـردا لـە لایەنـەوەکانی (محمدعلی)وە مزگەوتەکـە نـۆژەنو نـوێ کرایـەوە، بـەلاّم پاشماوەکانی زۆربەخراپی دەستی تێوەردرابوو کەزۆر بەیان رەش بۆنەتـەوەو لـەناوچوون، لەسـالّی (١٣٠٦ك) (١٨٨٨ز) بەشە گرنگەکانی شوێنی نوێژ کردن دووبارە نوێ کرایەوە لەسەر دەمی ئەمیر (عبدالرحمن کشخدادا بەتەواوی شوێنی نوێژکردن نـوێ کرایـەوە، کـارە نـوێ کردنـەوەکانی چـاك کردنـەوە هەربـەردەوام بـوو لەگـەڵ زیـادە کارەکـان بـۆ ئـەم مزگـەوتن لەسـەردەمی فاطمییـەکان لەسـەرەتای دروسـت کردنییـەوە، وای لێ هـات زانـراوە رەسـەنەکان بەتـەواوی لـەناوبچن بـەلاّم گرنگـترین نیشـانەکانی (معـالم) نەخشـە فاطمییـەکان تـا ئێسـتا بـەدیوارەکانی شـوێنی نوێژکـردن هـەرماوە هـەروەها نەخشـەکانی کەوانـەکانی شـوێنی نوێژکـردنو گومبەتـەکانی کەسـەرگەچ هـەڵ کـەنراون بەبەرگەجوانەکانییەوە هەرماون. سالّی ١٩٦١ ئەزهەر چووە قۆناغێکی نوێ لەمێژووەکەی کەبوو بەزانکۆیەکی نوێ لەگەڵ پاراسـتنی وانەئاینییـەکان کـە کـاتی خـۆی تیـایدا دەخوێندرا.

**سەرچاوە: لەرۆژنامەی (الحیاة) ژمارە (١٣٠٩) وەرگیراوە**



# فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ و پەروەردەی نموونەیی

عەبدولقادر مەلا ئەحمەد باداوەیی

کاتێ ناپلیۆن ئەلمانیای داگیرکرد تامی سەرکەوتنەکانی خۆی چێژت هێندەی نەبرد تاڵیە کەشی چێژت کاتێ فەیلەسوفی ناوداری ئەلمانیا (فەختە) بەگەل ئەلمانیای راگەیاند کەتاکە هیوایەکم هەیە کەبۆی دەژیم ئەویش ئەوەیە کەقەناعەت بەگەلەکەم بهێنم (پەروەردە تاکە رێگایە لەنەگبەتیو نەهامەتی داگیرکاران رزگارمان دەکا). ئەوەبوو ئەلمانیەکان قەناعەتیان بەبۆچوونەکەی (فەختە) هاتو ئەلمانیای یەکگرتوو هاتە کایەو ئەوساتەش (بسمارك) گوتی (ئەو سەرکەوتنەمان بەزانستو پەروەردە بەدی هێنا نەوەك بەهێزی سوپا).

هەڵبەت پەروەردەی نمونەییش بریتییە لە پڕ چەك کردنی هەموو هاوڵاتیەك بەهێزو هەڵوێستو دڵسۆزیو ئامادەباشی لەپێناو خوادا.

مرۆڤی ئیماندار کەبووە خاوەن پەروەردەیەکی نمونەیی هەست دەکا ئەوە حەقەو خودا پێی داوە بۆیە هەرگیز لێی هەڵناگەرێتەوە. کەچی هەر جۆرە پەروەردەیەکی تری جیا لەمە، دەبێتە جێگای رەخنەو تیۆرو بیروڕای جیاجیاو هەڵگەڕاوە لەیەکتر بۆیە وتویانە پەروەردە لەلانکەوە بۆ گۆڕە یا بەمانایەکی تر دڵخۆش کردنی مرۆڤە لەژیانی دونیاو قیامەتدا.

لێرەدا دەمەوێ بابەتەکە بەچەند نمونەیەك لە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ لەبابەتە جیاجیاکان دەوڵەمەند بکەم لەپێناو پەروەردەیەکی نمونەییدا.

سەبارەت بەپەروەردەی رۆحی، ئیبن عەباس رضي الله عنه دەگێرێتەوەو دەڵێ: رۆژێك لەپشت پێغەمبەر ﷺ وەستابووم بەمنداڵێکی دەگوت: (یاغلام إني أعلمك كلمات: إحفظ الله يحفظك احفظ الله تجده تجاهك اذا سألت فاسأل الله. واذا استعنت فاستعن بالله واعلم ان الامة لواجتمعت ان ينفعوك بشيء لم ينفعوك الابشيء قد كتبه الله لك وان إجتمعوا على أن يضروك بشيء لم يضروك الابشيء قد كتبه الله عليك)

* سەبارەت بەپەروەردەی فیکریشەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (فضل العالم على العابد كفضلي على ادناكم) رواه ابو امامه رضي الله عنه.

* هەروەها سەبارەت بەپەروەردەی رەوشتیەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: (مامن شيء أثقل من ميزان العبد المؤمن يوم القيامة من حسن الخلق وان الله يبغض الفاحش البذيء) رواه ابو الدرداء رضي الله عنه.

* سەبارەت بەپەروەردەی سۆزدارییەوە سەعدی کوڕی وەقاص رضي الله عنه دەگێرێتەوە (اراد عثمان بن مظعون ان يتبتل فنهاه رسول الله ﷺ).

* دەربارەی پەروەردەی کۆمەڵایەتیش پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ (مثل المؤمنين في توادهم وتراحمهم وتعاطفهم كمثل الجسد: اذا اشتكى منه عضو تداعى له سائر الجسد بالسهر والحمى) رواه النعمان بشير رضي الله عنه.

* سەبارەت بەپەروەردەی وەرزشیو سەربازیش عائیشەی دایکی ئیمانداران رضي الله عنها دەڵێ:

(سابقني الرسول ﷺ فسبقته، فلبثنا، حتى اذا ارهقني اللحم سابقني فسبقني فقال: (هذه بتلك).

* دەربارەی پەروەردەی تەندروستیش پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (مانزل داء الا انزل له شفاء) رواه ابو هريرە رضي الله عنه کتێبی خودای مەزنو پێغەمبەرە نازدارەکەی ئەوەیەکی نمونەیی پێگەیاند لەئیمانو پەرستیاریو بیرکردنەوەو رەوشتو مامەڵە کردندا هەتا زووە باخۆمان (خێزانو گەرەكو شارو کۆمەڵگەو گەلەکەمان بەپەروەردەیەکی نمونەیی پێبگەیەنین تاکو هەر هیچ نەبێ بتوانین ئەوەی داهاتوومان لەبێشکەوە تاکو قیامەت دڵخۆش کەین).

●



# ئارام گرتنو دان بەخۆداگرتن سیفەتێكی پیرۆزی ئیماندارانە

**عەلی حەسەن پوور (ورمێ)**

ئارام گرتن بریتییە لەدان بەخۆداگرتن لەئاست ئارەزووحەزو ئاواتەكانو ئەگەری دووچاری بوون بەئاستەنگو گرفتو تەنگو چەڵەمە، ئەویشیان دوو جۆرە:-

**یەكەمیان:** جەستەیی‌یە كەمرۆڤ سووربێت لەسەر بەرگە گرتنی ئازاو ئەشكەنجە، وەك ماندووبوونی سەفەرو گەشتوكوێرەوەری شەڕو نەخۆشی كوشندەو برین.

**دوەمیان:** دەروونیە، كەبەمەرلستی كردنو دان بەخۆداگرتنە بەرامبەر ئارەزووی‌سكو سێكسو هەژاریو برسێتیو لەكیس دانی خۆشەویستو دەربەست نەهاتن بەرامبەر رووداوە دڵتەزێنەكانی ژیان.

• دەرەئەنجامە پەسەند كراوو بەرچاوەكانی ئارام گرتن گەلێك زۆرن لەوانە : ئازایەتیو لەخۆبووردن. لێ بووردنو پاكژیی دەروونو نهێنی نەدركاندنو سنگ فراوانیو قەناعەت هاتو زیادكردنی بیروباوەڕی دەروونی.

ئەوەتا خودای پەروەردگار لەقورئانی پیرۆزدا لە (٧٢) شوێندا باس لەئارام گرتن دەكاتو فەرمان بەبەندەكانی خۆی دەدات كە لەژیانی‌تاڵو ناخۆشو ناهەمواردا سەبروئارامیان هەبێت بۆیەش دەفەرمووێ ﴿ یاأیها الذین أمنوا إستعینوا بالصبر والصلاة ان الله مع الصابرین ﴾ سورەتی البقرە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وبشر الصابرین الذین اذا أصابتهم مصیبة قالوا انا لله إنا الیه راجعون، أولئك علیهم صلوات من ربهم ورحمة وأولئك هم المهتدون ﴾ (سورەتی البقرە).

ئارام گرتن سیفەتێكی پاكو بەرچاوی موسڵمانو ئیماندارانە، كاتێك موسڵمان دەكەوێتە ناخۆشیو نارەحەتییەك پێویستە دان بەخۆ دابگرێتو ئارامو ورەی بەرز بێت، قایل بێت بەو رووداوەی كە خودای گەورە بۆ تاقی كردنەوەو پتەوییو لاوازی بڕوای موسڵمانو مرۆڤ دەیهێنێتە پێشەوە لەم بارەیەوە پێغەمبەری مەزنمان ﷺ دەفەرموێت: (الا أن الصبر من الایمان، بمنزلة الراس من الجسد، الا انه لاایمان لمن لاصبر له).

دوو نموونە بۆ ئارام گرتنو لەخۆ بووردوویی موسڵمانو مرۆڤی بەباوەڕ دەهێنینەوە، (یەكەمیان) ئەو چیرۆكەیە كە (ابن حجە) لەكتێبی (ثمرات الا وراق فی المحاضرات) نووسیویەتی كەتیایدا دەڵێت: جارێكیان (عەروەی كوڕی زوبێر) كەیەكێك بووە لەسەحابەكان لەشاری مەدینەوە بەرەو بارەگای خەلیفەی ئەمەوی‌یەكان (وەلید كوڕی عەبدولمەلیك) بەرێ كەوت، لەكاتی سەفەرەكەیدا پێیەكی وەرگەڕاو هەستی بەئازارێكی گەلێك زۆر كرد، بەلام بەردەوام بوو لەرۆیشتن، كەگەیشتە دیمەشق. پێی گەلێك ئەستوور ببوو، تووشی نەخۆشییەكی پێستی كوشندە ببوو بۆیە پزیشكێكی بۆ هێنراو داوای كرد كە دەبێت ئەو پێیەی ببڕێتەوە، (عەروە) داواكەی رەت نەكردەوە، بەم شێوەیە دوای بڕینەوەی پێ یەكەی خستیە ناو پارچە قوماشێكەوەو هەڵی گرتو لەو كاتەدا هەواڵێكی دڵتەزێنی پێگەیشت كە كوڕەكەی لەسەر پشتی حوشتر گلاوەو گیانی لەدەست داوە!

زۆری نەبرد، وەفدێكی تیرەی (بەنی عەبس)كە كوێرێكیان لەگەڵدا بوو هاتنە لای وەلیدو، دوای پشوویەكی كورت خەلیفەی ئەمەوی لەكوێرەكەی پرسی: چۆن چاوت وای لێ هاتووە؟ ئەویش لەوەلام گوتی: لەگەڵ هەندێ دۆستو یاوەران سەفەرێكمان كردو كوڕێكی بچووكو هەندێ پارەم لەسەر پشتی حوشترێك باركردبوو، كەوتینە دۆڵێك كە پڕی ئاو بوو، نەمزانی كامەیان رزگار بكەم، كوڕەكەم پەڕاندەوە سەر وشكایی، بەلام ئەوەندەم زانی پارەكەم بە ناوداچوو ئەوەندەی نەبرد گەڕامەوە بەدەم گریانی كوڕەكەم كەسەیرم كرد گورگ سەری لێ كردۆتەوەو خەریكی خواردنیەتی، چوومەوە لای حوشترەكەو لووشكەیەكی لێدامو چاوم كوێربوو، بەم شێوەیە چاوەكەمو كوڕەكەمو پارەكەمو حوشترەكەم لەدەستدا، وەلید فەرمانی‌دا كە بچن (عەروە) بێنن پێی گوت: مامە ئەو كابرایە لەتۆ زیاتر كوێرەوەریو كارەساتی دیوە، بەلام هێشتا ئارامگرو بەسەبرە بۆیە پێویستە مرۆڤی بەباوەڕ گوێ رایەڵی گشت پەندو ئامۆژگاریو رێنماییەكان بێتو بەدڵێكی پاكو بێ گەردەوە گوێ بۆ وتە پیرۆزەكانی قورئانو فەرموودە بەنرخەكانی پێغەمبەر ﷺ بگرێتو بزانێت كە ﴿ انمایوفی الصابرون أجرهم بغیر حساب ﴾ سورەتی(الزمر) هەروەها دەرك بەوە بكات كەعیبادەتو خواپەرستیو پەیرەو كردنی رێنماییو ئامۆژگاریەكانی پێغەمبەرمان (سلاوی خوای لێ بێت)، بەشێكە لەبیروباوەڕی ئارامو دان بەخۆراگرتن لەكاتی تووش بوون بە هەر كارەساتو گرفتێكو بۆ چارەسەركردنی پشت بەخوای مەزن ببەسرێت، چونكە دەفەرموێت ﴿والصابرین فی البأساء والضراء وحین البأس أولئك الذین صدقوا واولئك هم المتقون﴾.



# مالیك و كۆلەیەكی خواناس

**عەلی عوسمان**

مالیكی كوڕی دینار دەگێڕێتەوەو دەفەرمووێت: ساڵێكیان بێ بارانی ڕووی تێ كردین لە (بەسرە) ئێمەش چەند جارێك لەشار دەرچووین بۆنوێژ بارانە بەڵام باران نەباری، تاجارێك منو چەند كەسێكی دی دەرچووین تا گەیشتینە (مصلی) شوێنی نوێژكردنی (بەسرە)و لەوێ نوێژە بارانەمان كرد، بەڵام هەر نەباری، خەڵكە گەڕانەوە. بەڵام منو (ثابت البنانی) لە (مصلی) ماینەوە كاتێك شەو داهاتو بینیمان كابرایەكی ڕەشی قاچ باریكی سك گەورە، شاڵو پەشتەماڵێكی خوری پێوەیە هاتە لای ئاوەكەو دەست نوێژێكی گرتو دوو ركات نوێژی كورتی كردو دەستی بەرز كردەوە بۆ ئاسمانو گوتی:

(گەورەم هەتا كەی بەندەكانت بەدەستی خاڵی دەگێڕییەوە، ئایا ئەوەی هەتە تەواو بووە؟! سوێندت دەدەم بەخۆشەویستی تۆ بۆ من هەر ئێستا بارانمان بۆ ببارێنە..)

مالك دەفەرمووێت: هێشتا قسەكانی تەواو نەكردبوو هەور ئاسمانی گرتو باران باری بەسەرماندا هەروەك چۆن گۆزە سەرەو خوار دەكەیتەوە، نەمانتوانی لەمزگەوت دەرچین، ناچابووین خۆمان بدەین لەئاوەكە. سەرمان سوڕما لەم كابرایە ڕەشە بۆیە لێی چوومە پێشەوەو پێم گوت: (ئەوە شەرم ناكەیت لەوقسەیەی كردت؟)

گوتی: (گوتم چی؟)

گوتم: (كە گوتت سوێندت دەدەم بە خۆشەویستی تۆ بۆ من، تۆ چۆن زانیت ئەو تۆی خۆش دەوێت؟)

گوتی: دوور كەوەوە لێم ئەی ئەو كەسەی نەفسی خۆت خەریكی كردوویو خوای لەبیر بردوویەوە، من چی بوومو لەكوێ بووم، كاتێك ئەو یەكتاپەرستیو ناسینی خۆی فێركردووم. ئەگەر خۆشەویستی ئەو نەبایە بۆ من. ئایا ئەوەی پێ دەبەخشیم؟

ئەمەی گوتو ڕۆیشت، منیش گوتم (پێم گوت): (ئاگایەكت لێمان بێت)!.

گوتی: من (كۆیلەو ئەركی گوێ ڕایەڵی خاوەنە بچكۆلەكەم لەسەرە، ڕۆیشتو كاتێك چاودێرم كرد زانیم خۆی كرد بە ماڵی (مسگەر- نحاس)ێكدا سبەینێ كە ڕۆژ بووەوە، چوومە لای مسگەرەكەو پێم گوت:

(غولامێكت هەیە پێم دەفرۆشی) گوتی: بەڵێ .. سەد غولامم هەیەو یەك بەیەك هەموویانی نیشان دامو منیش هەر دەمگوت: (ئەوەیان نییەو یەكێكی دییە) تا لەكۆتاییدا گوتی: تەنها یەك غولامم ماوە تەماشام كرد ڕەشەكەیەو لەژوورێكی داڕووخاودا وەستاوە، گوتم (ئەمەم پێ بفرۆشە) (منیش لەبەر ئەمە ئەوەم دەوێت).

كابرای مسگەر بۆی بانگ كردمو گوتی: بەهەر چەند دەتەوێت بییە بەڵام هەر عەیبێكی هەبوو لەسەر خۆت.

مالیك دەفەرموێت: (لێم كڕی بە بیست دنیار)و لەگەڵ خۆمدا هێنام لەڕێگا پرسیاری لێ كردمو گوتی: (گەورەم بۆچی منت كڕی؟!)

گوتم: بۆ ئەوەی ئێمە خزمەتی تۆ بكەین. گوتی: بۆچی؟!

گوتی: مەگەر تۆ كابرایەكەی دوێنێ نەبووی لە (مصلی)؟!

گوتی: (بۆچی تۆ ئاگات لێ بوو؟!).

ئەمەی گوتو ڕۆیشت تاخۆی كرد بەمزگەوتێكداو دووركات نوێژی كردو پاشان گوتی: (گەورەم.. ئەی پەروەردگارم ئەوە نهێنی یەك بوو لەنێوان منو تۆدا، كەچی خەڵكت لێ ئاگادار كردەوە پێیان زانیوە، سوێند ئەدەم كەهەر ئێستا گیانم بكێشی)

مالیك دەفەرموێت: (ئەمەی گوتو گیانی دەرچوو).

سەرچاوە: المنهج التربوی



# پەروەردەی منداڵ لەئیسلامدا

جەمال گەلالی

منداڵ پیاوی دوا ڕۆژو هیواو ئاواتی نەتەوەو کۆڵەکەی بنیاتنانی کۆمەڵە، بۆیە ئیسلام بایەخی داوە بەپێك هێنانی خێزانێکی چاك. ئەمەو پاراستنی منداڵ، هەتا پێش لەدایك بوونیش وەك ئامادەکردنی ئەو هۆکارانەی کەدەبنە ساغو سەلامەتی لەشو تەندروستی لەشو هۆیەکانی بەهێزبوونی ژیری، هاوکات ئیسلام هانمان دەدا بۆ دەستنیشان کردنی دایکی باشو لەباشترین ڕەگەز وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (لەبەر چوار شت ژن دەهێنرێ) لەوانە (سامانو ڕەگەزی باشو جوانیو ئایینی) جا ئازابە و خاوەن ئایینەکە بخوازەو دەست پێشخەربە پاش ئەوەی منداڵ لەدایك دەبێ، ئیسلام زۆر سەرپەرشتیو بایەخی بەکامڵ بوونی لەشو عەقڵو ڕەوشتو ژیانی ناو کۆمەڵی داوە لەلایەن لەشییەوە ئیسلام سوورە لەسەر ئەوەی منداڵ دووساڵی تەواو شیری دایکی پێ بدرێ ئەوەتا خودای گەورە دەفەرمووێ: ﴿والوالدت یرضعن اولادهن حولین کاملین لمن اراد أن یتم لرضاعة﴾ سورة البقرة ٢٣٣.

منداڵ کەپێگەیشتو گەورە بوو، ئاینی ئیسلام ڕایسپاردووە فێری ڕەمبازیو مەلەوانیو سوار چاکی بکرێ بەمەبەستی خستنەوەی تەندروستی باشو بەهێز بوونی لەش بۆ غەزوات کردنو بەرگری لەخاكو نیشتمانەکەی.

لەهەمان کاتیشدا دەبینین ئیسلام داوای ڕەفتاری بەباش جوڵانەوە لەگەڵ منداڵ دەکات هەروەکو پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرمووێت (ئەگەر یەکێکتان منداڵی هەبوو، خۆشی بوێتو لەگەڵیا بچێتە ئاستی عەقڵی منداڵەکەی لەهەڵسو کەوتیدا لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ هەمیشە ئیسلام هانی منداڵ دەدات بۆ جێ بەجێ کردنی ئەرکە ئایینیەکانی سەرشانی لەگەڵ خۆشەویستی بەردەوام بوونی لەسەر ئەم ئەرکانە هەروەکو لەفەرموودەیەکی پێغەمبەرمان ﷺدا هاتووە کەدەفەرموێ (فەرمان بدەن منداڵەکانتان بەنوێژ کردن لە(٧) ساڵیداو لێدانو هەڕەشە کردن لێیان لە (١٠) ساڵیو هەروەها جیاکردنەوەی شوێنی نوستنی کورو کچ لەیەکتر جیابکەنەوە).

هەڵبەت ئیسلام دەست پێشخەرو سوور بووە لەسەر پێگەیاندنی منداڵ، دیارە موسڵمانیش لەم بارەیەوە بایەخێکی باشی بەتەندروستی لەشو عەقڵیو دەروونیو کۆمەڵایەتی منداڵ داوەو دەدات بۆ ئەوەی ببێتە مرۆڤێکی چاك لەدەروونو کۆمەڵگاو نەتەوەکەی.

# خێزانو چاك پێگەیاندنی منداڵ

دایکی ڕەبیان

سەرەتا قەوارەو پێکهاتی خێزان بریتیە لە (باوكو دایكو منداڵ) و هەندێ جاریش بریتیە لە (پیاوو ئافرەت بەتەنیا). ئەم خێزانەش بەشێکە لەکیانی کۆمەڵگەی وڵاتو هەروەها بەشێکیشە لە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بەگشتی، بۆ ئەوەی ئەم خێزانە ببێتە خێزانێکی نمونەییو کارامە بۆ وڵاتو بۆ کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیش ئەوا پێویستە هەر یەکێك لەتاكو ئەندامەکانی خێزان ئەرکی سەرشانو کرداری خۆیان بناسنو ڕایپەڕێنن بەتایبەت باوكو دایك. چونکە ئەمان یەکەم مامۆستای منداڵەکانیانو یەکەم پاڵپشتیانن بۆیە هەر یەکێك لە باوكو دایکان دەبێ ڕەچاوی هەندێ خاڵی گرنگ بکەن لەمانە:

## دەسەڵاتی باوك

١- لێزانینو هەبوونی مەعریفەیەکی ئەوتۆی پڕ بەپڕی خێزانپارێزی بۆ توانینی پەیڕەوو بەڕێوەبردنی پرۆسەی خێزان.
٢- هەبوونو پەیداکردنی پەروەردەیەکی پەیامیی بەهێز بۆ پەروەردەکردنی خۆیو خێزانەکەی لەسەریا.
٣- بەهەند هەڵگرتنی قسەو پێشنیارو داخوازییەکانی ئافرەتو منداڵەکان.
٤- مەئیووس نەبوونو تووش نەبوونی وەرسی لەکاتی تەنگو چەڵەمەو ورە بەرنەدان لەبەڕێوەبردنو تێکۆشان بۆ ڕەواندنەوەی چەرمەسەرییەکان.
٥- تێکەڵ نەکردنی بەرنامەی پەروەردەیی چاولێکراوو دروستکراو لەنێو خێزاندا.
٦- گەڕانەوە بۆ ماڵەوەو چاودێریکردنی خێزان دوای تەواو بوونی کار لەدەرەوەی ماڵدا.

## دەسەڵاتی دایك

١- بەهەند هەڵگرتنی داخوازییەکانی پیاوو پشت گوێ نەخستنی
٢- خۆ خەریك نەکردنو دوورەپەرێزبوونی لەکات بەفیڕۆ چوونی دەرەوەی ماڵدا.
٣- خزمەت کردنی منداڵەکانو ناساندنی دینو ڕەوشتو زانیاری پێیان.
٤- ڕازاندنەوەی ماڵەکەیو شێوەی جوانکاریان.

ئەمانە تا ئێرە پتر پەیوەندیان بە خۆئامادەکردنو خۆ ماندوو کردنی پیاوو هەبوو بۆ زێتر بەختەوەر بوونیان لەبەڕێوەچوونی پرۆسەی خێزان لەنێوانیاندا، بەڵام دواتر منداڵەکان دەسەڵات پەیدا دەکەنو مافیان دەکەوێتە سەر شانی دایكو باوکانیان، جا بۆ ئەوەی منداڵەکان ڕێچکەی هەقیقی بگرنە بەر. بۆیە لەسەر باوکانو دایکان پێویستە منداڵەکانیان بەچاکترین شێوە پێبگەیەنن.



# دادوەری لەقورئانی پیرۆزدا

عەبدولرەحمان پیرداود حەیدەر

یەكێ لە خاسیەتە پیرۆزو دیارەكانی قورئان ئەوەیە كە بۆ سەرجەم بوونەوەرو نەتەوەو چینێكی كۆمەڵگا هاتووە، دوا پرۆگرام و پەیرەویشە كەبۆ دوا پێغەمبەرو نێردراوی خوای ناردوویەتیە خوارەوەو بۆ هەموو دەورو زەمانێك شیاوەو دەشێت، و خاڵی لەسەر ئەو حەرفانەش داناوە كە بەبیرومێشكی مرۆڤدا دێت و پێیەوە دەكەوێتە گێژاوەوە.. یەكێ لەو مەسەلە گرنگانەی كە لەقورئانی پیرۆزدا هاتووەو بۆمان روون كراوەتەوە دادوەریی و پێكهات و فاكتەرە جۆراوجۆرەكانیەتی.. میتۆدە ئاكاریەكانی قورئان لەرووی دادوەرییەوە لەسەر دوو بناغەی سەرەكی دامەزراون كە ئەمانەن:

١- رەهایی لەدادی دامەزراو لەسەر چاكەكردن.

٢- هێزو ئەمانەت.

ئەم دوو بناغەیە بەیەكەوە هاتوون و بەبێ یەكترنابن و لێكترازانیان لەنێواندا نەبووەو نابێ. دادیش لەدەسەڵاتێكی چاكە بەخشدا وەدەست ناهێنرێ گەر لەدەسەڵاتداریا فەرمانرەوایەكی بەهێزو ئەمین نەبێ، چونكە هەروەك چۆن لەداری لاردا سێبەری راست ناكەوێتەوە! ئاواش گەر فەرمانرەوا راست و رێك نەبوو، ئەوە مەحاڵە دادو دادپەروەریی لەدەسەڵاتداریەكەی بەدی بكرێت.

ئەم دوو خاسیەتە ئاكاریەی سەرەوە -هێزو ئەمانەت- لەهەر نەتەوەو گەلێكدا بوونیان هەبوو و پیادەكران ئەوا بێگومان هێز لە دادوەریی و دادپەروەریی لەدادوەراندا مسۆگەر دەبێت، و وەك نەتەوەیەكی شارستانی رێزلێنراوی پێشكەوتوو لەمەیدانی ژیانا ناسنامەی خۆی وەدەردەخات، و لەژێر كایەو كاریگەریەتی هەر خاسیەتێك لەو دوو خاسیەتەی ئاماژەمان بۆ كردن چەندین رەوشت و سیمای تر لەهەمان خولگەو ئاراستەدا خول دەخۆنەوەو وەك لقێكی ئەم دارە بەرزو بەتینانە پەل دەهاوێژن.. و لەهەر هەنگاوێك لەهەنگاوەكانی فەرمانرەوایەتی و دادوەریدا یا لەهەر چەمك و لایەنێكی پەیوەندیدار بەمەسەلەكان جا چ ئەوانەی پەیوەندیان بە داواكار یا داوا لەسەر تۆماركراوەوە هەبێ یا ئەو ئەرك و پێویستیانەی دەكەوێتە ئەستۆی شایەد.. ئەوا قورئانی پیرۆز بێ پێچ و پەناو بەراشكاوییەوە عەدالەتە پشت ئەستوور بەچاكەكەی پیادەو جێبەجێ دەكات. ئەویش بەیارمەتی و توانای ئەوانەی كە هێزو ئەمانەتیان لاهەیە.

خوای بەخشندەو میهرەبان لەسورەتی نحل و لەئایەتی (٩٠)دا دەفەرموێ: ﴿ **إن الله يأمر بالعدل والاحسان** ﴾، وە بۆ جەخت كردنەوە لەسەر ناوەرۆك و مەبەستی ئەم هەقیقەتە لەچەندین ئایەتی تر پێمان رادەگەیەنێ و دەفەرموێ: ﴿ **انه لقول رسول كريم، ذي قوة عند ذي العرش مكين مطاع ثم امين** ﴾(التكوير١٩-٢٠)، هەروەها دەفەرموێ: ﴿ **ان خير من استأجرت القوي الامين** ﴾(قصص-٢٦).. ئایەتی تر لەم بارەیەوە زۆرن، بەڵام بەم چەند نموونەیە ئەو راستیە وەبیر خۆمان دەهێنینەوە كە بنەماو تەشریعی دادوەریی لەقورئانی پیرۆزدا بەم شێوەیە لەنێوان دادی بنیاتنراو و دامەزراو لەسەر چاكەو خێرو راستیی و دادپەروەرییەكی بەهێزی ئەمین دەسووڕێتەوە.. هەر لەمەشەوەیە هێزی دادو دادێكی بەهێز دروست دەبێ، ئەمەش خۆی لەخۆیدا زاڵبوون و باڵادەستی مرۆڤی بەهێزی راست وەدەردەخات كەزاڵە بەسەر

هەموو ئەو هەواو حەزو ئارەزووانەی کە بەلای شەڕو بێ خێری هەوڵی لارکردنەوەی دەدەن.

کاتێکیش ئەو بنەماو بناغانەی دادوەریی قورئانیان لەسەر بیناکراوە، دەهێنینە سەر خوانی پیادەکردن... ئەوا دەبینین ووردبینانە و دووربینانە چارو کلیلی هەموو ئەو مەسەلەو گرفتانەمان پێدەبەخشێ. کە پەیوەندیدارن بەلایەنەکانی داواو یاسادانانە دادوەرییەکان، وەك لەخوارەوە بەیارمەتی خوا هەندێ لایەنیان دەخەینە بەرچاو:

١- هێزی دەسەلاتدار لەهەر کات و شوێنێ بێ لەگەڵ هەقدایەو بەدوای هیچ کاریگەریەکی دەرەکی یا ناوەکی ناکەوێ‌و، ترس و حەزو ئارەزوو نایخلیسکێنێ تا لەهەق وەدوور کەوێتەوە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿**فلا تخشوا الناس واخشون**﴾ سورەتی مائدە-٤٤. وە هەروەها فەرموویەتی: ﴿**واذا قلتم فاعدلوا ولو كان ذا قربى**﴾ الانعام-١٥٢.. دووبارەئەمرمان پێدەکاتەوە کە راست و رەوا بین و حوکمەکانمان خوار نەکەینەوە گەر مەسەلەکان لەخۆمان و دایك و باوك و کەس وکاریشمان نزیك بێت.. وە دەفەرموێ: ﴿**كونوا قوامين بالقسط شهداء لله ولو على انفسكم أو الوالدين والاقربين**﴾ سورەتی النساء-١٣٥.

بەڵێ ئەم هەڵوێست و رەوشتانە لەئاکارو خاسیەتی مرۆڤی بەهێزو خاوەن بڕوای بەتینە، چونکە بەهیچ کلۆجێ بۆ بێ‌هێزو بێ دەسەلاتێك نەهاتووەو نەیتوانیوە بەرژەوەندیەکانی خۆی و کەس و کاری وەلابنێ‌و ئەو هەق و مافانە بۆ خودان بەرژەوەندی‌و هەقەکان بگێڕێتەوە، هەر لەبەر ئەوەشە قورئانی پیرۆز لەئاکاری بێ‌هێزو بڕوایەکان رازی نەبووەو نابێ. چونکە ئەو بێ‌هێزیەی کەقورئان باسیان لێوەدەکات لارخوازی‌و دوور لەهەق و راستی دەگەیەنێ.. بۆیە بێ هیچ گومانیش راستی‌و عەدالەتیش نیشانەی هێزو دەسەلات دەگەیەنێ.

٢- هێزی دادو دادی بەهێزی قورئان لەوەدایە کە جیاوازی لەنێوان دۆست و دوژمن، موسڵمان و غەیرە موسڵمان ناکات و بەیەك میزان مامەڵە لەگەڵ مەسەلەکان دەکات و هەقیش بەئەمانەتێك دادەنێ و دەبێ ئەو هەقەش بۆ خاوەنی راستەقینەی خۆی بگێڕدرێتەوە. هەروەك خوا دەفەرموێ: ﴿**ان الله يأمركم ان تؤدوا الامانات الى أهلها، واذا حكمتم بين الناس ان تحكموا بالعدل**﴾ سورەتی النساء-٥٨. دەرهەق بە جولەکەکان، قورئانی پیرۆز کە ئەو کۆمەڵە ستەم و درۆو دەلەسانەیان روون دەکاتەوە، بۆ ئەوەیەتی تا باش بیانناسین و بەترس و درۆکانیان هەڵنەخەڵەتێین.. لەگەڵ ئەوەشدا لەکۆتاییدا بەم شێوەیان باس دەکات: ﴿**وان حكمت فاحكم بينهم بالقسط ان الله يحب المقسطين**﴾ سورەتی مائدە-٤٢. سەبارەت بە نەسرانیەکانیش قورئانی پیرۆز ئاوا لەگەڵیان دەجوولێتەوەو دەفەرموێ: ﴿**فاحكم بينهم بما انزل الله ولاتتبع أهوائهم عما جاءك من الحق**﴾ سورەتی مائدە-٤٨. ئا ئەمەیە رەهایی لەعەدالەتی قورئاندا، کە خوا ئەمرمان پێدەکات تا لەگەڵ غەیرە موسڵمان و دوژمنەکانیشمان هەقپەروەرو دادپەروەربین.

٣- هێزێکی تری عەدالەت و عەدالەتێکی تری بەهێزی ئیسلام لەوەدایە کە ئەم هێزو عەدالەتە، لایەنە ناکۆك و خاوەن کێشەکان دەگەیەنێتە ئەو راستی‌یەی کە پێویستە ملکەچ و دانپێنەری ئەو حوکمانە بن کە لەسەریان دەردەچێت و ماوەی نارەزایی و گفتوگۆش نادات دەرهەق ئەو حوکمانە - کە سەرچاوەکانیان قورئانە- چونکە خوای پەروەردگار ئاگادارمان دەکاتەوە کە پێویستی سنووربەزێنی حوکمی خوا نەبین. وە هەر نارازی بوونێکیش تووڵەرێیەکی تاریکەو بەرەو رێگەی پڕ هەڵدێری کوفرمان دەبات. خوا فەرموویەتی: ﴿**فلا وربك لا يؤمنون حتى يحكموك فيما شجر بينهم ثم لا يجدوا في أنفسهم حرجاً مما قضيت ويسلموا تسليماً**﴾ النساء-٦٥. لەهیچ کاتێکیشدا ئاکاری هێز لەئیسلام لەگەڵ ئەوەدا نی‌یە بەهێزو دەسەلاتدار هەرچییەکی بیەوێ بیکات،و بەدوای هەواو ئارەزووی خۆی بکەوێ، چونکە دەسەلاتدار توانای کردنی هەیە، خوو رەوشتی هێز لە ئیسلامدا لەگەڵ ئەوەشدا نی‌یە کە خاوەن تواناو بەهێزەکان یاخی بن و لاوازو بێ دەسەلاتەکان



ـجەوسێننەوە.. بەپێچەوانەی ئەوەوە مێزو ئاکاری ئیسلامی داوا لەبەهێزو ـحەسـەڵاتدارەکان دەکــاو ئــەمری ـــوەیان پێدەکـا کـە گـوێ رایـەڵی ممەق و ملکەچی حوکمی عەدالەت بن، حۆ گەر پێچەوانەی ئەوە بێ، ئەوا بێگومان یاسـای جەنگەڵستان دێتـە کایەوە و گەورە بچووك لەناو ئەبات و بـەهێز لاواز تێکدەشـکێنێ و..هتـد، مەربۆیە خـوای پـەروەردگار جەخت ـسەر ئەو مەسەلە گرنگە دەکاتەوەو ـدەفەرموێ: ﴿ **وما كـان لمؤمن ولا مؤمنة اذا قضى الله ورسـوله امراً ان يكـون لهم الخيرة من امرهم** ﴾ الاحزاب-٣٦.

٤- یـەکێکی تـر لـەئاکارە بـەرزو پیرۆزەکـانی یاســاو پــەیڕەوەکانی قورئان دەرهـەق کێشـەی دادوەریـی و ناکۆکی و داواکردنی مافەکان، ئەوەیە لـــەپاش گەیشـــتن بـــەئاکام روون بوونـــەوەی راســـتی و گەیاندنـــەوەی ماف بەخاوەن مـاف رێگـەو ئـیرادەی چاکــەو لێبــوردن بــەپێی توانـــا.. لەبـەردەم خـودان مـاف دانـراوە گـەر بیـەوێ، چونکـە چاکـە لەگـەڵ هـەق و راستیی یەکێك لەئاکارەکانی بەهێزو تواناداراەکانـەو قورئـانی پـیرۆزیش لـــەزۆر شـــوێن ئـــەو راســـتی یەی دەستنیشـــان کـــردووە، هـــەروەك دەفـەرموێ: ﴿ **وان عـــاقبتم فعـــاقبوا بمثل ما عوقبتم به ولئن صبرتم لهو خير للصـابرين** ﴾ النحـل-١٢٦، هــەروەها دەفەرموێ: ﴿ **وان تعفـوا أقـرب للتقـوى ولا تنسـوا الفضـل بينكـم** ﴾ البقـرة-٢٣٧. لـەبارەی لێبوردن و چاکـەکردن خـــوا فەرموویـــەتی: ﴿ **وان تعفـــوا وتصفحوا وتغفروا فانَّ الله غفور رحيم** ﴾ التغـــابن-١٤. لێبووردنـــی بـــەهێز لــەقورئاندا لێخۆبشـــوونێکە لەگـــەڵ بوونـــی تونـــاو دەســـەڵات، بـــەڵام لێبووردنێـــك لەترســـنۆکی و بـــێ دەسـەڵاتیەوە بێتـە کایـەوە.. ئـەوە نیشانەی بێ هێزی و لاوازییەکـە کـە ئیسـلام رێگـەی پـێ نـەداوەو نـەهی لێکـــردووەو ئـــەمری ئـــەوەشمان پێدەکات کە بەرەنگاری جەورو ستەم ببینەوەو بەرپەرچیان بدەینـەوە، جا ئەو ستەمە چ بەرامبەر خود بکرێ یا کۆمـەڵگا بەگشـتی.. هـەر لەبـەر ئـەو هەقیقەتانەشـە کـە قورئـانی پـیرۆز لێبوردنێکی هاوشـان لەگـەڵ بوونـی توانا بە کارێکی بەرزو پیرۆز دادەنێ و پلەیەکە تەنها ئەوانـە پێیدەگـەن کـە ئـارامگرو خـاوەن بـەختێکی بـەرزن و جێگەی ئەوەن کە خـوای پـەروەردگار بەبەڵێنـەکانی خـۆی شـادیان بکـات، هەروەك دەفەرموێ: ﴿ **ولمن صبر وغفر فـان ذلـك لمن عـزم الامـور** ﴾ الشـورى-٤٣. هـــەروەها دەفـــەرموێ : ﴿ **ولا تستوي الحسنة ولا السيئة ادفـع بـالتي هي أحسن فاذا الذي بينـك وبينـه عـداوة كانـه ولي حميم ومـا يلقاهـا الاّ الذيـن صبروا ومـا يلقاهـا الاّ ذو حظ عظيـم** ﴾ فصلت-٣٤.

٥- قورئانی پیرۆز چەند بناغـەو رێبازێکی دادوەریی جێگیری روون و ئاسانی بۆ فـەرمانڕەواو دەسـەڵاتدار دانـاوە، تـا رێنیپشـاندەری بـن و پـەیڕەویان بکات، وە هـەر دەربڕین و رایەکی تری تایبەت گەر دەردەچێت لەسنوورو چوارچێوەی ئـەم بناغـەو یاسـا دامەزراوانـە، ئـەوا هیـچ هونەریـەکی تیا نی یە، هـەروەك خـوا دەفەرموێ: ﴿ **انا انزلنـا اليـك الكتـاب بالحق لتحكم بين الناس بما اراك الله** ﴾ النسـاء-١٠٥. هـەروەها دەفـەرموێ: ﴿ **وانزل عليهم الكتاب بالحق ليحكم بـين النـاس فيمـا اختلفـوا فيـه** ﴾ البقـرة-٢١٣. کاتێ خوای پەروەردگار داوای ئەوەمان لێدەکات کە حوکم بـەقورئان بکـەین، ئـاواش سـتەمکاری ئەوانـە ئاشـکرا دەکـات کـە لـەم رێگەیـە دەردەچن و کار بەم پەیڕەوو پرۆگرامە ناکەن، هەروەك فەرموویەتی : ﴿ **ومـن لم يحكـم بمـا انـزل الله فـاولئك هـم الظالمون** ﴾ المائدة-٤٥.

٦- قورئـانی پـیرۆز بـەرێنمایی و فەرمایشـتەکانی فێری ئاکاری بـەرزو چۆنیەتی مامەڵەمان دەکات، دەرهـەق مەسـەلەو گرفتـەکانی نێـو کۆمـەڵ و ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە چۆن و بە چ شـێوەیەك هـەنگاوەکان هـەڵنێین پـاش لێتۆژینـەوەو لێکۆڵینـەوەی هۆکارەکـانی نـاکۆکی و گرفتـەکان تـا دەگاتـە دوا قۆنـاغی بڕیـاردان و بەرزکردنەوەی کێشـەکان بـۆ دادگـا، بەئامادەکردنی شایەدو دابین کردنی پێداویسـتیەکان و ئـەو بەڵگانـەی پێویستن بۆ بڕیاردان.. ئەمەو قورئان هـەنگاوەکانمان بۆ شی دەکاتـەوە تـا دەگاتە ئەو ئاستەی چۆنیەتی حوکم دەرکردنەکەشمان بۆ روون دەکاتەوەو هەڵوێستی خاوەن گرفت و ناکۆکەکان دیاری دەکات و دەشبێ بەشێوەیەك بـــن لەتەشـــریع و پـــەیڕەوی موسـڵمانانەی خۆیـان سـەرچاوە



بگرن.. لەبەر ئەوەی بەهێزو رێزو راستە، بۆیە فێری ئەوەشمان دەكات تا لەگەڵ نەیارو ناحەزەكانیشمان بە ئەدەبو بەرێز بین، و ماوەی تخووب بەزاندنو دەستدرێژی كردنمان پێنادات و داوای ئەوەشمان لێدەكات كە بە بیر حاكمو دەسەلاتداران بهێنینەوە لەدادگایی كردنو فەرمانەكانیاندا راستو دادپەروەرانە هەڵسوكەوت بكەنو بوێرانە هەنگاوی راستو چاكی خۆیان بهاوێژن. وە ئەو هەقیقەتەش رابگەیەنن كە موسڵمانەكان یەكدەستو یەككگرتوون بۆ بنیاتنانی كۆمەڵگایەكی عادیلانە، هەروەك خوا دەفەرموێ: ﴿ اذ دخلوا على داود ففزع منهم قالوا لا تخف خصمان بغى بعضنا على بعض فاحكم بيننا بالحق ولا تشطط واهدنا الى سواء الصراط، انّ هذا أخي له تسع وتسعون نعجة ولي نعجة واحدة فقال اكفلنيها وعزني في الخطاب ﴾ سورەتی ص-٢٢. هەروەها دەفەرموێ: یا داود ﴿ انا جعلناك خليفة في الارض فاحكم بين الناس بالحق ولاتتبع الهوى فيضلك عن سبيل الله.. ﴾ سورەتی ص-٢٦. بەڵێ پیادەكردنی حوكمێكی راستو هەقپەروەرانە دووركەوتنەوەشە لەئارەزوو و مەبەستە تایبەتیەكانو گرتنەبەری رێگەی بێخەوشی خواشە... هەڵسوكەوت بەپێچەوانەی ئەوەش بێگومان ئازارو ئەشكەنجەی توندی خوامان بەرئەكەوێ كە بۆمانی ئامادە كردووە.

٧- چەمكو لایەنێكی تری گرنگی دادوەریی لەقورئان شایەدو گەواهی دانە، بۆیە قورئانی پیرۆز گرنگیەكی تایبەت و مەزنی بەلایەنی سێهەمی دادوەریی داوە، چونكە شایەد رۆڵێكی سەرەكیو بنەرەتی لەچۆنیەتی و ئاكامەكانی بریاردانو دادوەریی دەگێرێ. هەر لەبەر ئەوەش لەرێگەی چەندین بناغەی ئاكاریی بەرزەوە رێنماییمان دەكاتو بەیوەستمان دەكاتو داوامان لێدەكات دەستبەرداریان نەبینو پەیرەویان بكەین، لەبەر ئەوەی وەدەستهێنانو گەیشتن بە مافو راستیی پشت بەو لایەنە گرنگە دەبەستێ هەروەك ئاماژەمان بۆ كرد، هەر بۆیەش هەڵوێستو وەرگرتنو جولانەوەی هەنگاو بە هەنگاوی شایەدمان بۆ روون دەكاتەوەو لەچەند روویەكەوە بۆی چووە لەوانە:

- دانانو جێگیركردنی شایەد لەسەرجەم ئەو مامەلانەی لەنێوان خەڵكا دەكرێن، تاوەكو مامەڵەكردنەكە رێگەی دیارو ئەگۆری خۆی وەربگرێتو جولانەوەكان بەشێوەیەكی رێكو پێك ئەنجام بدرێنو رووە جیاجیاكانی ژیان و گەردوونیان پێ ئاوەدان بكرێتەوە. خوا فەرموویەتی: ﴿ واشهدوا اذا تبايعتم ولا يضار كاتب ولا شهيد ﴾ البقرة-٢٨٢. هەر بۆ پێكانی هەمان مەبەست خوا فەرموویەتی: ﴿..واستشهدوا شهيدين من رجالكم.. ﴾ البقرة-٢٨٢. ئەوەتا لەكاتی مردنو وەسیەت كردنیشا ئەو پێویستیو راستیەمان بۆ روون دەكاتەوەو دەفەرموێ: ﴿ ..شهادة بينكم اذا حضر احدكم الموت حين الوصية اثنان.. ﴾ المائدة-١٠٦.

- هەروەك خوا لەرێگەی قورئانەوە پێمان رادەگەیەنێ كە پێویستە كەسانی شایەد هەڵگری چەند خەسڵەتو سیمایەكی دیاریكراو بنو بتوانن رۆڵی خۆیان وەك پێویست ببینن، ئاواش لەهەنگاونانو كەسایەتی شایەدەكانیشمان بۆ دەستنیشان دەكاتو داوامان لێدەكات دەبێ شایەدەكان لەكەسانی راستو رەوا لێوەشاوە بنو توانای هەڵگرتنی باری بەرپرسیاریەتیان هەبێ، چونكە بریاری قورئان لەسەر چۆنیەتی شایەد دانەكان وەستاوە.. خوا فەرموویەتی: ﴿ واشهدوا ذوى عدل منكم﴾ الطلاق-٢. بەڵێ جیاوازی بریارەكانی قورئانو دادوەرییەكەی لەگەڵ هەر یاساو دادوەریەكی تر لەوەدایە كە قورئان پشت بەو شایەدانە دەبەستێ كە راستگۆو هەقپەروەرو خاوەن ئاكارێكی بەرزنو دوورن لەدۆرو بۆچوونی دوور لەواقیعو هەڵخلیسكان و لاركردنەوە بەلای تواناداراو دەسەلاتداران..

هەر لەسەر ئەم بنچینە نكۆڵی كردنی شایەد لەشایەدان بەكارێكی بێ رەوشتی دادەنرێ، چونكە هەق لەخودان ماف دەفەوتێنێو رێگەش بۆ دەستدرێژیكارو زۆردار خۆش دەكات بۆ پیادەكردنی مەرامی ناهەقو نارەوایان.. هەروەها خوا دەفەرموێ: ﴿ ولا يأب الشهداء اذا ما دعوا..﴾ البقرە-٢٨٢. كاتێ قورئانی پیرۆز گەواهی نەدانو خۆدزینەوە



ـەمبارخســتنی هەقیقــەت ـەیفەتێکی نارەواو لار دەزانێ، لە ـەمان کاتیشدا شاردنەوە یا ـەرەپۆشکردنی راستییەکانیش بە ـەوێکی جەورو ستەم حسابی بۆ ـەکات. چونکە شاردنەوەی ئەم ـیەدی دانە بێ هیچ شك‌و گومان ـەبێتە هۆی جەورو ستەم‌و هەر کاتێکیش ببێتە هۆی زوڵم‌و ستەم ـەوا خۆی لەخۆیدا بە زوڵمێکی ـوون‌و ئاشکرایە.. خوا لەم بارەیەوە ـەفەرموێ: ﴿ ومن اظلم ممن كتم شهادة عنده من الله وما الله بغافل عما تعملون﴾ ـبقرة-١٤٠. هەروەها فەرموویەتی: ﴿ ولا تكتموا الشهادة ومن يكتمها فانه آثم قلبه ﴾ البقرة-٢٨٣. هەر لەسەر هەمان هەڵوێستەوە دەفەرموێ: ﴿ ولا نكتم شهادة الله انا اذاً لمن الآثمين ﴾ المائدة-١٠٦. ئەوەی گومانیشی لێناکرێ ئەوەیە کەمرۆڤی خاوەن باوەڕ شایەدیەکانی بەراست‌و رێك و پێکی دەدات‌و دوورە لەدرۆو لارکردنەوە، هەر لەپاداشی ئەم رەوشتە بەرزەش خوای گەورە پاداشیان دەداتەوەو لەقورئانی پیرۆزیشدا باسیان دەکات‌و دەفەرموێ: ﴿ والذين هم بشاهاداتهم قائمون ﴾ المعارج-٣٣. هەروەها دەفەرموێ: ﴿ والذين لايشهدون الزور واذا مرّوا باللغو مرّوا كراماً ﴾ الفرقان-٧٢.

٨- یەکێکی تر لەمیتۆدە ئاکاریە بەرزەکانی قورئان لەمەلەسەی دادوەریدا ئەوەیە کەدادوەر خۆسەپێنەر نییە لەبیروڕاکانیداو هەر بەتەنهاش پشت بە زانست‌و زانیارییەکانی خۆی نابەستێ، بەڵکو سوود لەبۆچوون‌و هۆشمەندی خەڵکانی دەوروبەری خۆی وەردەگرێت‌و پرس‌و رایان پێدەکات، هەروەك خوای بەخشندە دەفەرموێ: ﴿ وشاورهم في الامر ﴾ آل عمران-١٥٩. هەر لەبەر ئەم ئەمردانەی خوایە پێغەمبەری مەزنمان ﷺ لەهەموو کەسێك زیاتر بەپیر ئەم بانگەوازەی قورئان هاتووەو هەردەم پرس‌و رای بەردەوام بووە لەگەڵ هاوەڵەکانی خۆی هەروەك لەوتەی ابی هریرە ﷺ هاتووە کە دەفەرموێ: (ما رايت احداً بعد رسول الله ﷺ اكثر مشاورة لاصحابه منه) رواه مسلم.

حەزرەتی حەسەنی بەسری ﷺ لەلێکدانەوەی ﴿ وامرهم شورى بينهم﴾دا دەفەرموێ: (بەخوا میللەتێ نییە کە نەگات بەراستیی کە مەرامە، گەر پرس‌و رایان لەنێواندا هەبوو، هەر بەو پرس‌و رایەیە دەگەن بە راستییەکان کە خواستی هەموو لایەکە.

خوای پەروەردگار دادوەریی بە زانیارییەوە بەستۆتەوە، ئەو زانیاریەی کە ئایینی خوا دەگرێتەوە لەگەڵ هیقهە تیایداو پیادەکردن‌و لەسەر رۆیشتنیشی، هەروەك حەزرەتی مالك کوڕی ئەنەس لەلێکدانەوەی (حکمة)دا روونی کردۆتەوە، خوای پەروەردگار لەباسی داود پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: ﴿ وآتيناه الحكمة وفصل الخطاب ﴾ ص-٢٠. لێرەدا مەبەست لە (فصل الخطاب) زانستی دادوەریەکەیەو (حکمە)کەش زانستییە ئایینییەکەو قووڵبوونەوە تیایداو لەسەر رۆیشتنی دەگرێتەوە، بۆیە دادوەریی بێ حیکمەت تووشی هەڵەمان دەکات‌و لەپەیرەوەکانی قورئان دوورمان دەخاتەوە. هەر لەبەر ئەوەشە خوای پەروەردگار مەسەلەی زانستە دادوەریەکانی بەزانستە ئایینیەکان بەستۆتەوە.

عومەری عەبدولعەزیز ﷺ دەفەرموێ: پێنج ئاکار هەیە گەر دادوەر لێیان دوور بکەوێتەوەو هەڵگریان نەبێ، ئەوا ئەو دادوەرە تووشی هەڵە دەبێ‌و پەڵەی عەیبداری بەشی دەبێت، ئەو خەسڵەتانەش ئەمانەن: تێگەیشتوویی، نەرم‌و حەلیمی، لەسەرخۆیی، پاکیەتی لە رەفتارو کرداری، راست بێت لەهەڵسوکەوتدا... (شرح ادب القاضي). بەڵێ گەر دادوەر هەڵگری ئەم خەسڵەتانە بوو ئەوا چەندو چوون لەهەواو ئارەزووەکان دوور دەکەوێتەوە لەکاتی حوکمدانەکانیدا.

گەر بەوردی سەیری میتۆدە ئاکاریەکانی قورئان بکەین لەرووی دادوەرییەوە، ئەوا دەگەینە ئەو ئاکامەی کە قورئان میتۆدێکی هەمەلایەنەی سەرتاپاگیری دوور لەکەموکوڕی‌و ستەم و لارکردنەوەیە.. بۆیە لەوەش دڵنیاین بەپیادەکردنی بنەماو میتۆدەکانی قورئان دەتوانین مافی مرۆڤ لەدادگاکاندا بپارێزین‌و بەمەش لاپەرەی جەورو مافخۆراوی و بێدادیی بۆ هەتا هەتایی هەڵدەدرێتەوەو کۆمەڵگایەکی پڕ لە دادو شارستانی لەدایك دەبێ.



# پێویستییە بنەڕەتییەکانی ژیان لەدیدگای ئیسلامەوە

ئا: سۆران قادر

ناسینی (پێویستییەکانی ژیان) (ضروريات الحياة) کاریگەری گرنگ بەجێ دێڵێ لەسەر فراوانبونی مەودای فیکری ئیسلامی هاوچەرخ و رەسەن، چونکە ناسینی ئەو پێویستییانە نۆبەرەی هەوڵدانە بۆ تێگەیشتنی تەواو لەدەقە شەرعیەکان (النصوص الشرعيه) دیارە تەعبیردانەوە لە مەدلولی دەقەکان تەنها لەرێگەی ماناکردن و رەمزاندنی دەقاو دەقی وشەو رستەکانەوە مەبەستی تەواو ناپێکی...

بەڵکو قووڵبوونەوە بەنێو ئاسۆی نهێنییەکانی شەریعەتدا (اسرار الشريعه)خوێندنەوەی واتاکانی ئەو دیوی زاراوەو مەدلولی دووەم و سێهەمی دەقەکان دەخوازێ..

کەواتە ئەمڕۆ جێی خۆیەتی کەهەموو کەسێکی موسڵمان ئاگاداری مەبەستەکانی شەریعەت (مقاصد الشريعه) بێت تا لەسەر پرۆگرامێکی روون و پاك ژیانی دینداری خۆی بەسەر بەرێ.

جا مەبەستەکانی شەریعەت خۆیان لەنێو بازنەی (بەدیهێنانی بەرژەوەندی و چاکەکان) (تحقيق المعالج) خڕ دەکەنەوە.. دیارە کەبەرژەوەندییەکانیش یەك جۆرنین بەڵکو هەیانە زۆر پێویستن و بەرێوەچوونی ژیان بەبێ بوونیان شتێکی مەحاڵە کەپێیان دەووترێت (ضروريات الحياة) وەهەشیانە لەخواررووی ئەمانەوەیە کەناو دەبرێن بە (حاجيات) واتە ئەو بەرژەوەندییانەی کەکاروباری خەڵکی پێویستییەتی بۆ هەڵگرتنی نارەحەتی و گرانی لەسەر بەرێوەچوونی. وەئەگەریش نەبن ئەوە یاسای ژیان تێك ناشکێ و کون و کەلەبەر ناکەوێتە نێو دیواری بنەڕەتی ژیان (اصل الحياة).

وەهەروەها جۆرێکی تر لەبەرژەوەندییەکان پێیان دەووترێت (تحسينيات) واتە ئەوانەی کەبەرێوەچوونی ژیانی خەڵکی والێ دەکەن لەسەر نەهجێکی باشترو تەواوتر جووڵە بکات. بەو واتایەی کەبەرەوشتە بەرزەکان پەردە پۆشی ژیانی ئاسایی خەڵکان دەکەن. وەگەر لەجیهانی بوونیشدا نەبن ئەوە ژیان رووبەڕووی تێك شکان و رووخان نابێتەوەو، خەڵکانیش بۆ بەرێوەچوونی کارەکانیان نارەحەتی و گرانیان نایەتە بەردەم... ئەمەی وتمان پێشەکییەك بوو بەڵام ئەوەی من دەمەوێ لەم باسەدا جەختی تەواوی لەسەر کەم بنەما فراوانەکەی (پێویستییەکانی ژیانە) (ضروريات الحياة) کە مەودایەکی خاوەن لق و پۆپەو، جێی تەفەکورو سەرنجدانی زانایانی ئیسلامییە.

وەکو لەپێشتردا وتمان (پێویستییەکانی ژیان) واتە ئەوانەی بەرێوەچوونی ئەصلی ژیانیان لەسەرە، بەو واتایەی کەنەبوونیان نەبوونی ژیان و تێك چوونی یاساکانییەتی.. ئەو پێویستییانەش پێنج دانەن کەشەریعەتی ئیسلامی بەبایەخ و گرنگییەکی زۆرەوە لە سەریان ئەدوێت کە بریتین لە(الدين - النفس- العقل- النسل- المال).

ئەمانە هەموو شەریعەتەکان چاودێرییان لێ کردووە لەبەرایی دروست بوونی ژیان و بەرپابوونی مرۆڤایەتییەوە. وەشەریعەتی ئیسلامی خۆشمان جەختی تەواوی لەسەریان هەیەو تەواوکاری و کۆڵەکەکانی بەرێوەچوونیانی دارشتووەو باسی لێوە کردووە..

ئەوەتا بۆ (دین) واتە ئایین و بەرنامەی ژیان کەئیسلامە باوەڕهێنان بەروکنەکانی کردووەتە بنچینەی بەدی هاتنی لەتاکەکانی کۆمەڵگەدا. هەروەها باوەڕهێنان



حمو:اکانی تری عەقیدەی ئیسلامی ِمکو باوەڕهێنان بەزیندووبوونەوەو یرمینەوە. پاشان هەر بەمەبەستی حیهێنانی دین کەیەکێکە ەمرووریانەکانی ژیان بنەماکانی حایەتی داڕشتووە وەکو نوێژو ِۆژوو حەج و زەکات. بەم شێوەیە ئەم شتانە دەبنە پرەنسیبی هاتنەدی ِمرورەتی یەکەم کە (دین)ە.... وە بۆ پاراستنی دین- واتە دوای ئەوەی کەهاتەدی- بانگەواز بۆ کردنی واجب کردووەو قەدەغەی ،وژمنایەتی و مەرامی تێکدانی کردووە بەواجب کردنی جیهادو هەوڵدان بۆ وەستان بەرووی تێکدەراندا. هەروەها قەدەغەی هەرکەسێك دەکا کەدەیەوێ تەشکیك لەعەقیدەی خەڵکدا بکات..

وەهەروەها فەتوادان لەسەر نەهجێکی لار یا بەتێکدانی ئەحکام قەدەغەکردووە دیارە کەقەدەغەکردنی ئەم کارانە هەمووی لەبەر پرۆسەی پاراستنی دینە تا نەزۆك بوون رووی تێ نەکات و مرۆڤەکانیش لەم خاڵە زەروورییە بێ بەش نەبن...

هەروەها شەریعەتی ئیسلام لەبەرنامەی پێکهێنان و بەدهێنانی (نفس)دا واتە -خودی مرۆڤەکانی بەو فۆرم و پێکهاتەی کەهەیەتی- ژن هێنان یاشووکردن (زواج)ی داناوە کەدیارە (زواج)تاکە هۆکاری فۆرمە لەبوونی کردەی مرۆڤ دروست بوونە وەبۆ پاراستنیشی چەندان حوکم و یاسای داناوە، بۆ نموونە لەئیسلامدا قەدەغەکراوە لەهەر شتێك کە (نفس) بەرو تیاچوون دەبات وەکو کوشتن.

هەروەها بەواجبی دەبێت ئەو کارانە بکرێ کەبەردەوامی بەنەفسی مرۆڤەکان دەبەخشێ وەکو خواردن و خواردنەوە، یاخود سزادانی ئەو کەسانەی ستەم لەنەفسی مرۆڤەکان دەکەن..

مەبەستی سەرەکیش لەبەدیهێنانی مرۆڤ ئاوەدان کردنەوەی زەوییە، بەیارمەتی دانی تاکەکانی دەوروبەری و خزمەتی بەرژەوەندییە گشتییەکان و پاك کردنەوەی دڵ و دەروونی خۆیی و هاوژیانانی.

یەکێکی تر لەپێویستییەکان (عقل)ە کەخوای گەورە بەخشیویەتی بەمرۆڤەکان، تابیێتە مۆلیدەی ئیرادەکانیان بۆ ئەوەی چەوت و راستییەکان لەهەموو شتێکدا ببینن.

هەروەها بۆ پاراستنیشی هەموو ماددە بێ هۆشکەرەکانی (مسکرات) قەدەغە کردووە نەك هەر ئەوە بەڵکو گەرسنوور شکێنراو ئەو جۆرە ماددانە بەکارهێنرا سزا بۆبەکارهێنەرانی واجب دەکات هەروەها ماددە سڕکەرەکان لەنموونەی حەشیشەو تلیاك و ئەم جۆرە شتانەش دەچنە مەودای (محرمات) قەدەغەکراوەکانەوە. لێرەدا گرنگی عەقڵ دەبینین لەدەقە شەرعیەکان و فیکری ئیسلامیدا. ئەوەتا پراکتیکی فیکرە گەندەڵەکان- واتە ئەوانەی لەگەڵ رەوتی عەقڵانییەتدا ناگونجێن- یاساغ کراوە. چونکە پەروەردگاری مەزن دەیەوێت بەرژەوەندی بۆ عەقڵەکان بەدی بێنێ چ لەدونیاو چ لەپاشە رۆژدا.

· دیارە کەبەرژەوەندی پاشە رۆژیش گەورەترە، چونکە لەوێ هەموو شتەکان لەجیهانی نەمری و هەتا هەتاییدان جائەگەر عەقڵ مەودای کارو بەرنامەی خۆی لەدەست نەدابێت ئەوە دەبێتە عەقڵێکی بەختەوەری نەمرو هەتا هەتا.. بەڵام بەپێچەوانەشەوە دەبێتە عەقڵێکی بەدبەختی بێ کۆتا، بەڵام ئەو نەمرییەش ژیانی تێدانییە- بەو واتایە کەلەخۆشییەکانی ژیانی دوا رۆژەوە دوورە- وەکو خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ **ثم لايموت فيها ولايحيى**﴾.

باسی گرنگی عەقڵ لەئیسلامدا مەودایەکی فراوانی داگیر کردووە کەلێرەدا بواری نووسینی نییە، بەڵام بەکورتی دەڵێین: ئیسلام مەبەستییەتی عەقڵەکان بەختەوەری هەردوو دونیا کات بۆ ئەمەش پرۆگرامی بۆ ناردووەو باسی ئەو خاڵە ئیجابییانەشی کردووە کەلای مرۆڤەکان پەنهانن. وە بووەکان (موجودات)ی بۆ حەڵاڵ کردووە بەمەرجێ زیان بەئێستاو پاشە رۆژی نەگەیەنێ.

خاڵی چوارەمی پێویستی ژیان بریتییە لە (تسل) واتە وەچە خستنەوەو دروست کردنی جیل و کۆمەڵگە. کەدیارە بۆ فەراهەم هێنانی ئەم پێویستیە (زواجی شەرعی) داناوە هەروەها لەپرۆسەی پاراستنیدا زیناو کاری ناشەرعی حەرام کردووە، وەسزای بۆ شەرواڵ



پیس و زیناکاران داناوە- دیارە مەبەستمان لەسزایەتی هەر لەژیندا-، نەك سزای دوا ڕۆژ، ئەمڕۆ باسی ئایدزو هاوشێوەکانی مێشکی بیسەرانی کاس کردووە.

دیارە فاکتەری سەرەکی ئەم دەردەش لادانە لەو ڕێگەیەی شەریعەت دایناوە بۆ پرۆسەی نەسل کە (زواجی شەرعی‌یە) وەچەندان نموونەی.. کەبەوورد بوونەوە لەتێکستە شەرعییەکان دەردەکەوێت..

وەخاڵی پێنجەمیش کە (مال)ەیەکێکی ترە لە پێویستیەکانی ژیان کەئیسلام حەلاڵ کردنی کارو کاسبی و واجب کردنی هەوڵ و تێکۆشانی بەشێوەیەکی شەرعی کردووەتە پیشەتایەك بۆ بەدەهێنانی ماڵ و سەروەت- دیارە ماڵیش دەورێکی لەبەرچاو ودیاری هەیە بۆ ژیانی مرۆڤەکان بەگشتی. هەر بۆیە ئیسلام بانگەشە دەکات بۆ بەدەست هێنانی بەشێوەیەکی شەرعی ئەوەتا بەرنامەکانی مەودای موعامەلات بەجۆرێکن کەهەردوو بەرژەوەندی دونیاو دوا ڕۆژی تێدا ڕەچاوکراوە وەبۆ پاراستنیشی دزی و زیان گەیاندن بەسەروەتی خەڵکی و .. هتد حەرام کراوە، هەروەها سزای دزیکاران دانراوەو زەمانەتی ماڵی فەوتێنراو کراوەتە یاسایەك و واجب کراوە کەپەیڕەوی بکرێ..[1].

ئەوە بەکورتی باسی پێویستی‌یە بنەڕەتیەکانی ژیان بوو ... بەڵام دەبێ ئەوەش لەبیرنەکرێت کەبەرژەوەندی‌یەکان (المصالح) یەك پلەو جۆر نین.

بەڵکو لەگرنگی پێدان و پەیڕەوی کردندا دەبێ ڕەچاوی (ضروریات) لەپێش ئەوەی باس لە _(حاجیات) یا (تحسینیات) بکرێت. وە (حاجیات)یش باس لێوە بکرێ لەپێش (تحسینیات)ەوە، بەمەرجێ زیان بەزەروریات نەگەیەنێ، هەروەها (تحسینیات) پەیڕەو دەکرێت بەمەرجێ زیان بەزەروریات یا (حاجیات) نەگەیەنێ.. وەبەوشێوەیە.

وەهەروەها پێنج خاڵەکەی (ضروریات) یش- کە (دین و نەفس و عەقڵ و نەسل و مال)ە لەنێو خۆیاندا لەیەك پلەدانین، بەڵکو بەپێی ڕیزبەندی ناوەکانیان دەبێ ڕەچاوی جێ بەجێ کردنی هەریەکێکیان بکرێت. واتە بەرژەوەندی دین لەپێش نەفسەوەیەو نەفسیش لەپێش عەقڵەوەیەو.... بەو شێوەیە.

بۆ نموونە: لەحاڵەتی شەڕدا (القتال) قەدەغەنەکراوە لەوەی کەشەڕکەران (نەفس)ی خۆیان دەخەنە نارەحەتی و حاڵەتی تیاچوونەوە کەیەکێکە لەپێویستی‌یەکانی ژیان. نەك ئەوە بەڵکو واجبی کردووە کە بجەنگێن و گوێ نەدەنە نەفس و لاشەیان..

ئەمە بۆچی؟ چونکە شەڕ کردنی ئەو نەفسانەو هەوڵدانیان بۆ چوونە پێشەوە لەجەنگداو پاراستنی وڵات- ئەگەر چی تیاچوون و نارەحەتیان تووشی دەبێ- دەبێتە هۆی پاراستنی بەرژەوەندییەکی لەنەفس گەورەتر کەخاڵی یەکەمە واتە (دین) چونکە گەر وازلەجیهادو پاراستنی وڵات بهێنرێت و ڕێگا بدرێت دوژمنان و ناحەزانی ئەم میللەتە وڵات داگیربکەن، ئەوکاتە فیکری خەڵکیش داگیر دەکەن و فەسادو تیاچوونی دین دەخەنەوە. بەم شێوەیەگەر پلەکاری لەبەرژەوەندییەکان و خاڵەکانی زەروریاتدا بکەین کۆمەڵە یاساو حیکمەت و پرۆگرامی زۆرمان بۆ دەردەکەوێت کە ئەوە بۆ خوێنەری بەڕێز جێ دێڵین.

ئەمە کورتەیەك بوو بۆ کردنەوەی ئەم جۆرە باسانەو ناساندنی لای خوێنەرانی بەڕێز، بەو ئومێدەی توانیبێتم خزمەت بەناوەڕۆکی بابەتەکە بکەم.

١) خوێنەری بەڕێز ئەو نموونانەی لەدرێژەی باسەکەدا هێنرانەوە تەنها بۆ ڕوون کردنەوەن، بەڵام هەوڵدان و گەڕان بۆ سوودی تەواو لەم جۆرەباسانە دەکەوێتە سەربەڕێزت کەدەبێ بەووردی سەرنجی قورئان و حەدیس و سەرچاوەکانی تری تەشریع بدەیت بەتایبەتی ئەو دەقانەی لە (مقاصد الشریعە) دەکۆڵنەوە.

تێبینی: بۆ ئەم باسە سوود لەم کتێبانە وەرگیراوە

* الوجیز في أصول الفقه. ص. ٣٧٨- ٣٨٣ د. عبدالکریم زیدان.
* الموافقات. للامام الشاطبي ج/٢
* مرۆڤ و ڕێبازی ژیان، مامۆستا ناسری سوبحانی- ئامادەکردنی عبدالله علی.



# پێ بەشینی میراتو حیکمەتی دوو ئەوەندەیی پیاو لەبەرامبەر ئافرەت

مریەم عمران

دیارە خودای گەورەو کاربەجێ بەندەکانی خۆی زۆر خۆش دەوێو هەموو شتێکی بۆیان دابین کردووەو دواتریش بەهەزاران شتێکی تری بۆ موسەخەر کردوون تا بتوانن کاروباری خۆیان لەژیاندا رایەڕێنن و تووشی هیچ چەرمەسەریو دەستەوستانێك نەبن لەرۆژەکانی ژیانیاندا، بەڵگە نەویستە کەقورئانی پتەوو جوانو پیرۆزو تەواو بەرنامەیەکی شایستەی بەنرخی خودای گەورەیە کە بۆ مرۆڤی دابەزاندووەو هەموو بنجو بناوانی ئەم ژیانەی بۆ خستۆتە روو بەجۆرێك ئەگەر دەستی پێوەبگرێ سەربەرزو سەرفرازی دونیاو قیامەتیشی دەکات. قورئانێك هیچ شتێکی لەژیانی مرۆڤدا جێ نەهێشتووە مرۆڤ تێیدا دڵگیربێتو نەزانێت چۆن کارو کردەوەکانی خۆی رایەڕێنێ. قورئانێك کە تەواوکاری کتێبەکانی پێشووی خوایە کەبەسەر پێغەمبەرە نازیزەکانی تری دابەزاند بوو (علیهم الصلاة والسلام) قورئانێك کەبەسەر پاکترین مرۆڤو پێغەمبەری سەر رووی زەوی دابەزێنراوە ئەویش (محمد)ە ﷺ.

جا ئەوەی لێرەدا دەمانەوێ بیخەینە روو تەنها مەسەلەیە کە لەژیانی مرۆڤدا ئەویش (میراتو بۆمانەوەی موڵكو ماڵی باوكو دایكە)، دیارە ئێمە لێرەدا نامانەوێ بچینە بنجو بناوانی بابەتەکەو هەریەکەی بەشەکانو کەسەکانو رێژەکان بەپێی دووری نزیکی کەسەکان دیاری بکەین بۆ وەرگرتنی (بەشەمیراتو ماڵەکە) تەنها ئەوەندە نەبێ دەمانەوێ حیکمەتو کاربەجێییەکانی میراتو رەحمەتی خودای میهرەبان بخەینە روو لەم بارەیەوە کە ئایا بۆچی پیاو دوو ئەوەندەی بەشی ئافرەت وەردەگرێ لەبەشەمیراتدا؟!.

(لەوانەیە هەندێ کەس پرسیار بکەن بۆچی بەشی ئافرەت نیوەی بەشی پیاوە لەگەڵ ئەوەی کەئافرەت لەپیاو بێ تواناترەو لەو زیاتر پێویستی بەپارەو هاوکاری کردن هەیە؟ وەڵام: شەریعەتی ئیسلام جیاوازی لەنێوان بەشی پیاوو ئافرەتدا کردووە لە وەرگرتنی میراتدا بۆ ئەمەش چەندین حکیمەتی بەرزیش لەم مەسەلەیەدا هەیە لەوانە:

**یەکەم:** ئافرەت پێداویستیەکانی بۆ دابین کراوە، چونکە خەرجییەکەی ئەرکی کوڕەکەی یان باوکی یان براکەی وەیا خود خزمو کەسانی دیکەیەتی...

**دووەم:** ئافرەت ئەرکی مەسرەف کردنی هیچ کەسێکی پێ رانەسپێراوە بەپێچەوانەی پیاو کە ئەرکی بەخێوکردنی خاووخێزانەکەیو ئەوانەی لەسەرە کەپێویستە مەسرەفیان بکێشێ.

**سێیەم:** خەرجییەکانی پیاو زۆرترەو ئیلتزاماتی مەزنتری لەسەرە بۆیەش پیاو پێویستی بەپارەی زیاتر هەیە لەئافرەت.

**چوارەم:** مارەیی ئافرەت لەسەر پیاوانە هەروەها ئەرکی ئامادەکردنی خانووبەرەو خۆراكو جلو بەرگی ژنو منداڵەکانیشی لەسەرە.

**پێنجەم:** کرێی فێر کردنی منداڵانو پارەی چارەسەری نەخۆشو نرخی داوو دەرمانی ئافرەت و منداڵان هەموو لەسەرپیاوە نەك ئافرەت جگە لەوانەش گەلێك ئەركو مەسرەفی تریش لەسەر پیاون کەبەپێی شەریعەتی ئیسلامی پیرۆز پێی راسپێرراوەو بەفەرمانی خودای باڵا دەست لەسەر شانی دانراوە:

﴿ لینفق ذو سعة من سعته ومن قدر علیه رزقه فلینفق مما آتاه الله ﴾ دیارە خودای گەورە لەم ئایەتی (٧)ی سورەی (الطلاق)ە دەفەرموێ با لەنێوە دەوڵەمەندبە گوێرەی دەوڵەمەندییەکەی خۆی نەفەقە بداتو ئەوانەش کە کەمیان دەست کەوتووە لەدەوڵەمەندی ئەوانیش بەگوێرەی خۆیان ببەخشن لە وەی کەخوا پێی داون.

جا لەم روانینە خێرایەدا حیکمەتی گەورەی خودای کاربەجێمان بۆ روون دەبێتەوە لەبواری جودا کردنەوەی (نێرینەو مێینە) چونکە هەر کەسێ ئەركو ئیلتیزاماتی زیاتر لەسەرشان بێ، بەپێی مەنتیقی دادگەریو یەکسانی شایانێتی بەشی زێتر دەبێ، لەگەڵ ئەوەش کەئیسلام بەشی پیاوی دوو بەشی ئافرەت داناوە ئافرەتیشی بەرەحمەتو میهرەبانی داپۆشیوەو زیاتری داوەتێ لەوەی کەبە خەیاڵی



دادیّ بەم پییەش ئافرەت لەپیاو ئاسودەو شادترە. چونکە ئافرەت لەگەڵ پیاودا بەشدارە لەوەرگرتنی میراتدا لەگەڵ ئەوەی کەپابەند نییە بەهیچ پاشەکی‌یەك‌و بەشی خۆی وەردەگریّ‌و هیچ نابەخشیّ، پارەکەلەکە دەکات بی ئەوەی هیچی لیّ خەرج بکاو هاوبەشی پیاو بکا لەمەسرەفەکانی ژیان‌و پیداویستی‌یەکانی مالدا.

دیسان شەریعەتی ئیسلام ئافرەت پابەند ناکات بەسەرف کردنی پارەکەی بۆ خۆی یا بۆ منداڵەکانی هەرچەندە دەولەمەندو دەست رۆیشتووش بیت لەکاتی بوونی میردا چونکە میردەکە بەرپرسیارە لەمەسرەف کردن بۆ ئافرەتەکەو منداڵەکانیشیان، لەماڵ خۆراك‌و جل‌و بەرگ هەروەك خوای گەورە دەفەرمویّ ﴿وعلى المولود له رزقهن وكسوتهن بالمعروف﴾ (البقرە ٢٣٣) واتە لەسەر کەسیك کەمنالی بۆ لەدایك بووە• (ئەویش باوکە) دەبیّ خۆراك‌و پۆشاکی دایك بەجۆریکی شیاو ئامادەبکات.

## میراتی ئافرەت بەر لەئیسلام

پیش هەڵاتنی رۆژی روونی ئیسلام ئافرەت هیچ بەشی لەمیرات نەدەدرایێ. بەبیانووی ئەوەی کەئافرەت ناجەنگیّ‌و داکۆکی لەخیلەکەی ناکات‌و دەیان گوت: (چۆن ماڵ بدەینە یەکیك کە نەسواری وڵاغ ببیّ‌و نەشمشیر هەلگریّ‌و نەلەگەڵ دوژمندا بجەنگیّ) بەم جۆرە ئافرەتیان وەکو مندالیکی ساوا لەمیرات بی بەش دەکرد، جا شەریعەتی ئیسلامی پیرۆز بریاری‌دا کەئافرەت مافی وەرگرتنی میراتی هەبیت. میراتەکەش وەردەگریّ زۆر بەبیّ منەتی‌و چاکەو دڵ پی سووتانی کەسیشی لەسەرنییە.

بەلکو یەکیکە لەفەرزەکانی خوای گەورە بۆیان، کاتیك کەئایەتەکانی میراتیش دابەزین عەرەبەکان ئەو مەسەلەیەان زل هاتە بەرچاوو چاوەریّی نەسخ کردنەوەی حوکمەکەبوون چونکە پیچەوانەی ئەو شتانە بوو کەلەسەری راهاتبوون.

ئەوە کاری ئیسلامە لەگەڵ ئافرەت. زولمی لەسەر هەلگرتووەو دوژمنکاری لەسەر لاداوەو میراتی داوەتیّ لەکاتیك کەلیی بی بەش کراوە لەگەڵ ئەوەی کەپیاوانیش پییان خۆش نەبووە) بەڵام ئەمە کردەی خودای کار جوان‌و میهرەبانە بەرامبەر بەبەندەکانی بەرنامەیاز بۆ دادەریژیّ کەئەوان نایزانن‌و خودای زاناو شارەزا دەیزانیّ چی شتیك خیرو چاکەو بەرەکەتی تیدایە بۆ هەموو لایەك‌و هەموویان بەنیرو میّ‌یانەوە، بگرە بەئاژەڵ‌و گیاندارو بی گیانانیشەوە..

# ئافرەت لەتێڕوانینی ئیسلامەوە

نووسینی: د. عەلی عەبدولواحد وافی
وەرگیرانی: جەمال ئیسماعیل گردە سۆری

ئەوەی پەیوەندی بەئەرکەکانی ژیانەوە هەیە. ئایینی ئیسلام بەچاوی گرنگی پیدان‌و بەزەییەوە سەیری ئافرەت دەکات هۆیەکانی نان پەیدا کردنی بۆ دابین کردووە کەدەیپاریزیّ لەپیشیل کردنی ماف‌و تەنگوچەلەمەکانی لە ژیانیدا، هیچ جۆرە بارگرانی‌یەکی ئابووری پیویستی نەخستۆتە سەرشانی بۆ بەخیوکردنی خەلکی ترو تەنانەت خودی خۆیشی، ئەگەر میردیشی نەکردبیّ بارگرانی پیویستی کەوتۆتە سەرکەس‌و کاری یان یەکیّ لەخزمەکانی بەگویرەی پلەی فیقهی ئیسلامی لەدانانی نەفەقە بۆی، ئەگەر میردی کرد بوو ئەوا خەرجی‌یەکەی دەکەویتە سەرشانی میردەکەی. ئەگەر ئافرەتەکە دەولەمەندبیّ‌و توانای خۆ بەریوەبردنی هەبیّ، یان نەدارو دەست کورت بی، هاوکات میردی نەبوو، یان خزمیکی بەتواناشی نەبوو بۆ پارە خەرج کردن لیی، ئەوا خەرجی‌یەکەی دەکەویتە سەرشانی دەولەت.

ئایینی ئیسلام تەواوی مافەکانی شارستانی وشیاری ئافرەتی پاراستووەو پایەی بۆداناوە لەهەلگرتنی پەیمان‌و خۆ بەستنەوەکانداو جیّ بەجیّ کردنی هەموو جۆرە پەیمان دانیك لەکرین‌و فرۆشتن‌و رەهن‌و دیاری بەخشین‌و راسپاردن‌و شتی تر، هەروەها مافی ئەوەی پیدراوەکەشتی سەربەخۆی هەبیّ جودا لەخەلکی ترو هەروەها دەسەلاتی تەواویشی هەبیّ لەسەر سامان‌و دارایی ئەمەو ئافرەت لەئایینی پیرۆزی ئیسلامدا کەسایەتییەکی شارستانی تەواوی هەیەو سامانە تایبەتی‌یەکەشی جیان لەکەس‌و کارو میردو سامانەکانیان، هەلبەت نابیّ نەکەس‌و کاری‌و نەکەسیکی تر دەست بخەنە سامانەکەیەوە، تەنها ئەگەر خۆی رازی بی، هەروەها بۆ میردەکەشی نابی هیچ کاتیك



ـیارەی وا کاریکات کەپەیوەندی هەبێ بەسامانی ئەوەوە، ـەها ئەو کاتە ئەبێ ئەو رێی پێ بدات یان بیکات ـوەکیلی خۆی لەئەنجامدانی لەجیاتی ئەو، هەڵبەت لەم ـەدا ئەتوانێ جێگریەتیەکە هەڵوەشێنێتەوەو یەکێکی ـر ـبینێ ئەگەر وای ئارەزوو لێ بوو. هەروەها بۆی ناکرێ ـێ لەماڵەکەی ببات جا کەم یا زۆربێ هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ **وان اردتم إستبدال زوج مكان زوج وآتيتم حداهن قنطارا فلا تاخذوا منه شيئا أتاخذونه بهتانا وإثما مبينا** ﴾ هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ **ولا يحل لكم أن تاخذوا مما أتيتموهن شيئا** ﴾ ئەگەر بێتو مێرد ماوەی نەدرێت شتێ ببات لەوانەی باسکران کەداویەتی بەژنەکەی، دەنا ـاشبێ هیچ شتێ ببات له سامانە تایبەتیەکەی ئەودا بەڵام ـابینی پیرۆزی ئیسلام کەدانی ناوە بەهەردوو بڕیاری پێشتر، ـاوەی ئافرەتیش دەدات کەوا بەئارەزووی خۆی هەرکارێك ـەنجام بدات ئەگەر لەدەرەوەی ماڵیش بێت، بەمەرجێك ـەشێوەیەکی رەوشت پاکانە ئەم کارە بکات. هەروەها نەبێتە ـۆی زیان گەیاندن بەهەڵسوکەوت و لایەنی کۆمەڵایەتی، ـیارە ئەو رەفتارەش نابێتە کۆسپێك لەرێگەی جێ بەجێ کردنی ئەرکەکانی تری بەرامبەر مێردو ماڵو منداڵەکانی، کە ئەمەش دەگونجێت لەگەڵ وەزعەکانی خودی خۆی ـەناوخێزانو کۆمەڵدا، هاوکات ئەم کارە ماوەی ئەدات ـەئارەزووی خۆی شت ببەخشێت بەمێردیو منداڵەکانیو ـەماڵەکەی خەرج بکات بەماندوو بوونی خۆی وەیان شتی ـەپارەکەی. هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ **فان طبن لكم عن شيء منه نفسا فكلوه هنيئا مريئا** ﴾ (أسماء) کچی (ابوبکر) ﷺ (کەخوشکی عائشەی دایکی موسڵمانانەو خێزانی زوبێرە) دەفەرموێ: (خزمەتی زوبێرو هەموو ماڵەکەیو ئەنانەت ئاگارداری ئەسپەکەیشم دەکردو ئالیکم پێ دەدا، دەولکم دەخستە ناوبیرەوە، ئاویشم دەدا، تارادەیەك ئافرەت بەشداری کاروباری شەڕیشی دەکرد لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ و لەدوای ئەویش. بەڵێ لەغەزاکانی پێغەمبەر ﷺ هەر (ئافرەت) بوو کەهەڵدەستا بەیارمەتیدانی پیاوانو ئەنجامدانی کاروباری پێویست بۆ بریندارا، هاوکات دوای سەردەمی پێغەمبەر ﷺ مێژوو هەڵوێستی پاڵەوانیەتی بۆ ئەو ئافرەتانە تۆمار کردو لەکاتی ئەم غەزاو شەڕانەدا، لەوانە (امیە کچی قەیس غەفاری) کەوا پێغەمبەر ﷺ تەگبیری بۆ کرد لەئەنجامی چێشتنی ئازارێکی زۆر لەغەزای (خەیبەر)دا لەدوای کۆتایی هاتنی غەزایەکە ملوانکەیەکی خستە ملیەوە کەبەدرێژایی ژیانی ئەم ملوانکەیە سینگی رازاندبوووە کاتێ کەمردیش لەسەر راسپاردەی خۆی لەگەڵ تەرمەکەیدا ناشتیان (دایکی حەکیم کچی حارس) بەشداری شەڕێکی کرد لەنێوان رۆمو موسڵماناندا کەئێستا کاڵای بوکێنی دانەکەندبوو هاوکات بوو بەرامی بوکێنی هەر لێ دەهات، کەلەبەرچاوی خۆی مێردەکەی شەهیدکرا، دایکی حەکیم لەجیاتی ئەوەی بگریت و هاواربکات، خۆی توند پێچایە وەو چووە مەیدانی شەڕەوەو حەوت کەسی کوشت لەدوژمنان لەبەر (قەنتەرە) کە ئێستاش تاکو ئەمڕۆ بەناوی (قەنتەرەی دایکی حەکیم) ناسراوە، بۆ ئەوەی ئافرەتی موسڵمان بتوانێ هەموو مافەکانی خۆی بپارێزێو ئەو شتانە جێبەجێ بکات کە پێویستە لەسەری و ئەوانەی ماوەی دراوە لەکارو فەرمانەکانیدا بەباشترین شێوە.

ئاینی پیرۆزی ئیسلام ماوەی بەئافرەت داوە فێری زانیاری ببێت بە هەموو جۆرو قۆناغەکانیەوە. بەڵکو بەئەرکێکی سەرشانی داناوە لەسنووری پێویستی خۆی بۆ ژیانی دونیاو قیامەتی، لەم بارەیەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: (طلب العلم فريضة على كل مسلم ومسلمة) زانیاری فێربوون ئەرکێکە لەسەرشانی هەموو ژنو پیاوێکی موسڵمان (دایکی ئیمانداران) حەفسە کچی عومەر کوڕی خەتتاب ﷺ نووسینەوە لەسەر دەستی ئافرەتێ فێردەبوو کەناوی (شەفاء عودەوی) بوو کە لە(رەچەڵەکی عودەوی)یە. کە هۆزێکی قورەیشیە، لە بنەماڵەی عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ کاتێ پێغەمبەر ﷺ خواستی داوای لە (شەفاء) کرد کەوا فێری خوشنووسی بکات هەروەکو چۆن فێر نووسینەوەی کرد بوو ئەم هەوڵدانە ماندووبوونە رەنگ دەداتەوە لەبەشداربوونی ئافرەتی لادێ لەگەڵ مێردەکەیو ئەندامانی خێزانەکەی لەکاروباری بەرهەم هێنانو ئەو پێویستیانەی کەژیانی خێزانداری پێویستیەتی لەکارو بارەکانی رۆژانەیدا، هەوکات ئەم هەوڵو تێکۆشانە ئافرەتیە لەجیهانی عەرەبدا ناسراوە هەر لەسەردەمە کۆنەکانەوە تا ئەمرۆش وەك خۆی ماوەتەوە لەهەموو جۆرە قۆناغەکانی مێژوو کۆنترین رەوشتو بارودۆخی خۆشی پاراستووە باشترین نموونە بۆی ئەوەیە کەئێستا دەبینرێ لەو چینانەی کەوا خەریکی ئیشوکاری کشتوکاڵین لەلادێکاندا کەگرنگترین چینی گەلن لەبەرهەم هێناناو لەهەمووشیان فراوانترنو ژمارەشیان زۆرترە.

---

**سەرچاوە : المرأة المسلمة في العصر الحديث**



# گرنگیدان بەعەقڵ: لەئایینی پیرۆزی ئیسلامدا

محەمەد فەلاح

وەك ئاشكرایە ئایینی پیرۆزی ئیسلام: خوای پەروەردگار وەك دیارییەك بۆ سەرجەم گرۆهی مرۆڤ و مرۆڤایەتی ، لەرێی سەرداری مرۆڤایەتییەوە پێغەمبەرﷺی بۆ مرۆڤایەتی نارد.. كەبەكۆتایی ئایینە ئاسمانیەكان دادەنرێت، هەروەها پێغەمبەرەكەشی (محەمەد) ﷺ دوا ئەلقەی زنجیرەی پێغەمبەرانی خوایە.

ئەم ئایینە پیرۆزە لەكاتێكدا نازڵ بوو كەسەرجەم كۆمەڵگەی بەشەری، لەسەر زەویدا، لەزۆنگاوی گومڕایی و سەر لێ شێواویدا نوقم بوو بوون.. بەشێوەیەك كەهەموو كردارێكیان، چ ڕەفتار چ گوفتار. لەسەر بنچینەی ئارەزوو، هەواو هەوەس ئەنجام دەداو ئاراستە دەكرد بەڵام هاتنی ئەم ئایینە پیرۆزە كە(نزیكەی هەزارو پێنج سەد ساڵ لەمەوبەر)ە.. خوای كردگار بەڕەحم و بەزەیی خۆی كردیە دەروازەی تیشكێكی زێڕین و بەسەر بەشەریەتدا والأی كرد: كەسەرقافڵەی ئەو نورەخواییەش فەخری عالەم (محەمەد)ﷺ بوو كەخوای مەزن لەوەسفیدا دەفەرموێ ﴿ وأنك لعلى خلق عظيم ﴾ سورەتی القلم/٤.... ﴿ وماارسلناك الا رحمة للعالمين ﴾ سورەتی الانبیاء/١٠٧

گومانی تێدانییە كە، بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی، هەموو ئەو ئایین و پێغەمبەرانەی كەخوای كردگار بۆ كۆمەڵگەی مرۆڤایەتی ناردووە: هەموویان یەك ڕایەڵی سەرەكی هاوبەش و ئاسۆیی بەیەكیانەوە دەبەستێتەوە..

ئەویش بانگ كردنە بۆ یەكتاپەرستی -التوحید- و واز هێنان لەپەرستش بۆ جگە لەخوای تاكە هێزوخاوەن دەسەڵات. ئەم ئایەتە پیرۆزانەش سەلمێنەری ئەو راستیەن: ﴿ ولقد ارسلنا نوحا الى قومه انى لكم نذير مبين، ان لاتعبدوا الا الله انى اخاف عليكم عذاب يوم عظيم ﴾سورەتی هود/٢٥،٢٦ .. ﴿والى عاد اخاهم هودا قال: يا قوم اعبدوا الله ما لكم من اله غيره، ان انتم الا مفترون﴾ سورەتی هود/٥٠... ﴿والى ثمود أخاهم صالحا، قال ياقوم اعبدوالله مالكم من اله غيره ﴾ هود/٦١... هەروەها چەندین ئایەتی پیرۆزی تر كەتەئكیدیان لەسەر یەكتاپەرستی كردۆتەوە.

بەڵام خەسڵەتی دیارو بەرچاوی ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئەوەیە كەجوڵاندنی عەقڵ و هۆشی مرۆڤەكانی زۆر لەلامەبەستە بەجۆرێك كەدەروازەی جوڵاندنی عەقڵی كردۆتە ئەو دەروازەیەی كەمرۆڤ لێیەوە داخڵی جیهانی بەرینی پڕ لەرەحمەتی ئیسلام دەبێت ئەوە تاخوای كردگارو مەزن لەئایەتێكی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿أنا أنزلناه قرآ نـاً عربياً لعلكم تعقلون ﴾ یوسف/٢ كەواتە یەكێك لەمەبەستە بەرزو پیرۆزەكانی هاتنی ئیسلام خستنەوەگەڕی هۆشە، چونكە خوای مەزن لەوەسفی ئەوانەدا كە گومڕان و سەرپێچی فەرمانی خوا، دەكەن دەفەرمووێت: ﴿ أولئك كالانعام بل هم أضل ﴾الاعراف/١٧٩.

ئەمە سەرەڕای ئەوەی كەیەكەم ئایەتی پیرۆز كەنازڵ بوو.. وشەی (اقرا) (بخوێنە) بوو، بەڵێ، هەر چەندە لەتەفسیردا واهاتووە كە (اقرا) واتە خوێندوە بەمانای كەلیمە- واتە خوێندوەی ئاسایی بەواتا ناسراوەكەی؛ بەڵام ئەم وشەیە مانایەكی مەجازی گەورەو فراوانتری لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە، ئەویش خوێندوەی مرۆڤە بۆ زاتی خۆیی دەورروبەر وەك بوونەوەر. ئەوە تاخوای پەروەردگار دەفەرموێت ﴿ أفلاينظرون الى الابل كيف خلقت، والى السماء كيف رفعت، والى الجبال كيف سطحت ﴾ الغاشیە/١٧،١٨،١٩.

پاشان دەفەرموێ ﴿ فذكر انما انت مذكر ﴾ الغاشیە/٢١ هەموو ئەمانەش ئەوە دەگەیەنێت كە



ـمر مرۆڤ پێویستە خوێندنەوەو ـێرامـــانێکی وردی هـــەبێت بـــۆ حویی و دەوروبەر بەجۆرێك کەهەوڵ ـ.ت لەفەلسەفەو حیکمەتی هاتنە حوونی خۆیی و بونەوەر بگات.

مرۆڤ نـاتوانێت زاتـی خـوای کردگـار ببینێــت بــەڵام دەتوانێــت ـوێنەواری هـێزو دەســەڵاتی بـێ ـ‌یـانی خــوای مـــەزن ببینێـــت ﴿سنريهم أياتنا في الافاق وفي انفسهم حتـــى يتبـــين لهـــم أنـــة الحق...﴾فصلت/٥٣.

کــەخوای کردگـــار نیشـــانەو ـ‌یەتەکانی خۆی نیشانی ئێمەدەدا ـوچی؟.. بۆ ئەوەی مرۆڤ تێ یـان ـ‌بمێنـــێ و بیـــان خوێنێتـــەوەو ـ‌شانیش مل کەچی دروستکار – خالق – مکەی بێت.

هاتنە خوارەوەی یەکەم ئایـەت ـموشـــەی (اقـــرا) هـــەر چـــەندە پێغەمبەرﷺ نەخوێنەوار بوو، ئەوە ـگەیـەنێت کـەخوای مـەزن داوای خوێنـــدوەی ئاســـایی – بـــەمانای کەلیمـــــە –ی لەپێغەمبـــــەر ﷺ ـــــــەکردووە بـــــەڵکو داوای خوێندنـــەوەی لێ کـــردووە بـــەمانا مەجازیەکـــەی ئـــەویش رامـــان و تێفکرین و، وردبوونـەوە لـەمرۆڤ، ـمبوونەوەر، لە ژیان... پێغەمبەری خوا ﷺ هەر لەسەرتاوە کەسێکی هۆشمەندو خوێنەوار بوو: ئەوە بوو هـــەمو جـــارێك کەســـــەردانی ئەشـکەوتی حـەڕای دەکـرد بـۆ تێفکریـــن و بیرکردنـــەوە بـــوو لەدەســەڵاتی خـوای مـەزن ئەمـە ســەرەڕای ئــەوەی کەکەســێتیەکی بەرزی هەبوو لەنێو شاری مەککەدا چونکە کەسێك بوو لەسەر بنچینەی هــەواو هــەوەس هــەڵس و کــەوتی نەدەکرد بەڵکو کەسێکی هۆشمەندو هێمـن بـوو هـەر بۆیـەش سـەرۆك عەشـیرەتەکانی مەککـە کردیانــە حەکـەم لـەدانانی بەردەرەشــەکەدا لەبـەر ئــەوە هەرچـەندە مـرۆڤ خاوەنی مەعریفەی ئەکادیمی بێت و کەسێکی خوێنـەواربێت – بـەمانای کەلیمە – بەڵام ئەگەر تێڕمانی وردو رۆچوون لەجەوهـەوری شـتەکانیدا نەبێت ئەوا ناتوانرێت پێی بوترێت خوێنـەوار ئـەوەتا خـوای مــەزن دەفەرموێت ﴿ولقد ذرأنا لجهنم كثيرا من الجن والانس لهم قلوب لايفقهون بها و لهم أعين لايبصرون بها ولهم أذان لايسمعون بـهـا..﴾ الاعـراف ١٧٩ لـەم ئایەتــە پــیرۆزەوە ئــەوەمان بــۆ دەردەکەوێت کەوا هەندێك (مرۆڤ، وەجین) هـەن سـەرەڕای ئـەوەی کـە هـۆش و چـاوو گـوێ شـیان سـاغە بـەڵام هیـچ سـودێکی نیـە بۆیـان لەتێگەشــتن و بینـین و بیسـتن.. بۆچـی؟! چونکـە بینـین و بیسـتن و تێگەیشــتنی ئەوانــە تەنــها بــۆ رووکەشـــی شـــتەکانەو ناچێتــە جەوهەریانـەوە کەئـەویش ناسـینی هـەق و شـوێنکەوتنیەتی .. چونکـە ئەمانــە هــۆش و چــاوو گـــوێی راســـتەقینەی خۆیـــان لەئاســـت راستی و ناوەرۆکی شتەکاندا لەکار کـــــەوتووە.. هـــــەر بۆیـــــەش بەموشـریکەکان دەوتـرا جـاهیل و نەفام.. خۆ خوێندەواریش بوون .. بەڵام چونکە هەقیان نەدەناسی پێ یان دەوترا نەفام.

ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئـاینێك نیـە کــەمرۆڤ کوێرانــە شــوێنی بکــەوێت بـــەڵکو ئاینێکــە پـــڕە لەزانســت و زانیـاری بینـا لەسـەر عەقل، هەربۆیەش لەبەڵگەدا هەندێ جـــار دەوترێــــت مــــەعقول مــــەنقول، هــــەروەها دەشــــبینین بەزانایانی بەرێزی ئـاینی ئیسـلام دەوترێــت (زانـا) کەواتــە ئـــاینی پــیرۆزی ئیســـلام زۆر گرنگـــی بـــەهۆش و خوێنـــەواری بەهــــەردوو مانا حەقیقی و مەجازیەکەیەوە داوە هەروەك لەچەندین ئایـەتی پـیرۆزدا بەدیار دەکەوێت: .. افلا يعقلون... افلا تعقلون... لعلهم يفقهون، لقـوم يفقهون، وەهـەروەها خـوای کردگـار لـەقورئانی پـیرۆزدا ئـەو راسـتیە دووبارە دەکاتـەوە کە دەفـەرموێت: ﴿ وقـالوا لو كنا نسمع أو نعقل ماكنـا في اصحـاب السـعير ﴾الملـك/١٠. بـەم شـــێوەیە بۆمـــان دەردەکـــەوێت کەئەگـەر مـرۆڤ هـەندێك هۆشـی خۆی بجوڵێنـی و خـۆی و بونـەوەر بخوێنێتەوە بەشێوەیەکی مەنتیقی و مەوزوعی ئەوا یەکسەر دەسەڵات و هـێزو گـەورەیی خـوای مـەزنی بـۆ دەردەکەوێت و تەسلیمی شـەریعەتە پاکەکـەی دەبێــت.. بــەڵام ئەگــەر کەسێك لەســەر بنچینــەی هــەواو ئارەزوو رەفتار بکات ئەوا کەسێکی نـــەخوێندەوارە باشــــە هـــادەش هەرچەند بەرزبێت، چونکە هـۆش و عـەقڵی خـۆی فـەرامۆش دەکـات و بەمـــەش مەنتیقیانـــە بۆشـــتەکان ناڕوانێ دواتریش هەق نابینێ.

تێبینـی: خـــۆش (عـــەقڵ) یەکێکــە لـــە مەبەستەکانی شەریعەت (مقاصد الشريعة).





# فرە ژنی لەنێوان فیقیهی ئیسلامو ویستی پیاودا

نــەوا محمد ســعید

دیارە ئافرەت ئەو کەسە خاوەن هەستو سۆزو خاوەن مافەیە کە خوای گەورە ئەم سیفەتانەی پێ بەخشیوەو لەسەر پیاوی کردووە کەرێزی هەستو سۆزی بگرێتو کەسایەتییەکەی بپارێزێت رێزگرتنەکەشی نەك لەکاتی یەك ژنی دابێتو دوای بەسەرداهاتنی حاڵەتی (استثنائي) پێ شێلی بکاتو لەدنیا نەبوونی‌دا دابێت دەمێکە دژانو ناحەزانی ئیسلام دەمی گلاویان بەرامبەر بەئیسلام مافدەر درێژ دەکەنو قسەی نالەباری لەدژ دەکەن وەخۆیان بەپێشکەوتو ئواز دەزانن کەئەوان دژی فرە ژننو رێز لەئافرەت دەگرن گوایە ئیسلام ستەم لەئافرەت دەکات کەژنی تری بەسەر بێت.

بەڵام دیارە ئەوانە لەئەشکەوتە تاریکەکانی نەفامی دادەژینو بێ ئاگاو غافڵن لەوەی کەئیسلام بۆ فرەژنی (ضوابط)ی مەحکەمی داناوە هەر بۆ ئەوەی مافی ژیانی پێ شێل نەکرێتو سوکایەتی بەکەسایەتییەکەی نەکرێت.

## مێژووی فرەژنی

لەراستی‌دا فرەژنی بەر لەهاتنی ئیسلام لەنێو زۆر گەلاندا باو بووە. لەو گەلانەش عبریەکانو عەرەبەکانی سەردەمی نەفامی بووە، گەلانی (الصقالیە) یان (السلافیون) کە زۆربەی ئەو وڵاتانە دەگرێتە خۆ کەپێیان دەڵێن: (روسیا، لیتوانیا، لیثونیا، استونیا، بولونیا، تشیکۆ سلۆڤاکیا، یوغوسلافیا) هەروەها لەلای هەندێ گەل (جرمانی وسکسۆنیا) فرەژنی هەبووە کەزۆربەی ئەو وڵاتانە دەگرێتە خۆ کە پێیان دەڵێن: (ئەلمانیا، نەمسا، سویسرا، بەلجیکا، هۆڵەندا، دانیمارك، سوێد، نەرویج، ئینگلترا) لەبەر ئەوە پڕو پاگەندەیەوپووچەڵ کرایەوە کەدەڵێ ئیسلام داهێنەری ئەم سیستەمە (فرەژنی)یە. لەراستی‌دا سیستەمی فرەژنی ئێستاکەش لەنێو گەلانێ کەئاینیان ئیسلام نیە بەربڵاوە وەك ئەفریقیاو هیندو صینو یابان. دیارە ئیسلامی دادگەر گرنگی زۆری بەم مەسەلەیە داوەو مەرج داری کردووەو چەند بنەمایەکی ریشەیی بۆ داناوە تاوەکو زوڵمو ستەمو پیاوسالاری پیادە نەکرێت، رێگەشی بەفرەژنی داوە و سنوورداریشی کردووە، خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وان خفتم الاتقسطوا في اليتامى فانكحوا ما طاب لكم من النساء مثنى وثلاث و رباع﴾ النساء :٣.

لەفظی (انکحوا) هەرچەندە بۆ ئەمرە بەڵام لێرەدا بۆ رێگەپێدانە نەك بۆ واجب بوون. فرەژنیش ئەگەرچی رێگەپێدراوە بەڵام کورت هەڵهاتن لەسەر یەك ژن لەروانگەی ئیسلامدا (مستحب)ە کە ئەمەش باشترە، لەکاتی ترسان لەزوڵمو ستم کردنو دادگەری نەکردن فرەژنی حەرام دەبێت.

## بەپێی ئەم مەرجانە فرەژنی حەڵاڵە

ئیسلام کەرێ بەفرەژنی دەدات بەڵام رەها (مطلق)ی نەکردووە بەڵکە بەچەند قەیدێکی توندو چەند مەرجێکی سنورداری حەسم کراو بەن کردووە کەئەمانەن:

١- ژمارە (العدد): فرەژنی تەنها لەچوار ژن کورت هەڵدێ، پیاو بۆی حەڵاڵ نیە لەیەك کاتدا لەچوار ژن



...تری هەبێت ئەم مەرجەش لەقورئان و سوننەتدا ثابت ...وە. لەقورئاندا خوای گەورە دەفەرمووێ: (مثنى وثلاث ورباع).

تێگەیشتنی جەماوەری زانایان لەم ئایەتەدا بریتییە ...تەنها کورت هەڵهاتنی چوار ژن لەسوننەتیشدا فەرموودەی زۆر هەیە لەوانە: کەغیلان الثقفی (١٠) ژنی هەبوو، جا کەموسڵمان بوو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (اختر منهن اربعا) (رواه البخاري) حیکمەت و دانایی لەسنووردار کردنی فرە ژنی کەپیاو بۆی هەبە چوار ژن بهێنێ ئەمەیە:

**یەکەم:**

دانانی سنوورێك بۆ فەوزای فرەژنی کەبەر لەهاتنی ئیسلام بەربڵاو بووە کەئەو کاتە ژن وەك شتومەك مامەڵەی لەگەڵ کراوەو پیاو بەئارەزووی خۆی ژمارەی ژنی زیاد دەکرد، جا ئیسلام هات و ئەم زوڵم و ستەمەی لەسەر هەڵگرتن و پلەو پایەی شایستەی خۆیانی پێ بەخشین.

**دووەم:**

خوای بەخشندە کە توانای جەستەو نەفسی بەپیاو بەخشیوە، پیاو ناتوانی هاوسەنگی لەنێوان زیاتر لەچوار ژن و پیادەکردنی دادگەری بکات.

سنووردار کردنی چوار ژن لەگەڵ سروشتی پیاو یەك دەگرێتەوە.

٢- دادگەری (العدل): دادگەری پێچەوانەی زوڵم و ستەمە، دادگەری بریتییە لەئینصاف،بەخشینی ماف، وەرگرتنی ماف دادگەری لەفرەژندا مانای یەکسانی لەنێوانیان دەگەیەنێ لەمافەکانی ژن و مێرددا. بەڵگەلەسەر مەرجی دادگەری بۆ رێگەدان بەفرەژنی فەرمایشتی خوای گەورەیەکە دەفەرموێ: (**فان خفتم الاتعدلوا فواحدة**) النساء :٣) هەروەها فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ زۆرە کەداکۆکی لەسەردادگەری دەکات و جەورو ستەم حەرام دەکات وەك دەفەرموێ: (من كانت له امراتان يميل لاحداهما على الاخرى جاء يوم القيامة يجر احد شقيه ساقطا (اومائلا) (رواه الخمسة) گەر پیاو لەوە ترسا کەنەتوانێ دادگەری لەنێوان ژنەکانیدا بکات ئەوە لەسەری پێویست (واجب)ەکە یەك ژن بهێنێ و نەیکات بەدوان و سێ یان و

چوار. دادگەری مەرجێکی بنەرەتییە بۆ رێگەدان بەفرەژنی ئەویش کەپیاو لەسەری تاوانبار دەبێت پابەند بوونە بە دادگەری لەکارە رواڵەت (ظاهر)ییەکاندا ئەوەی کەلەتواناو ویستی پیاودایە پیادەی بکات وەك یەکسانی کردن لەنێوان ژنەکاندا لەنەفەقەدان و نۆرەمانەوەو خواردن و پۆشاك و خانوو دۆستایەتی و رێزگرتن. بەڵام ئەوەی کەلەتوانای پیاودا نیە بۆ دادگەری بکات بریتییە لەمەیلی دڵ (قلبی) و خۆشەویستی و ئارەزوو (شهوە) کەبە دادگەری نەکردن لەم بارەوە پیاو پێی تاوانبار نابێت. چونکە خۆشەویستی هەستێکە لەسەرووی ویستی مرۆڤەو ناتوانێ بەویستی خۆی رەفتاری پێ بکات. ئارەزوو (شهوە) پاش بەندی خۆشەویستی ومەیلی دڵ (قلبی)یەو بەجیاکردنەوەی هەر دووجۆری دادگەری دەتوانین پێچەوانەیی رواڵەتی نێان هەردوو فەرمایشتی خوای گەورە لابەین.

کەدەفەرموێ: ﴿ **فان خفتم الاتعدلوا فواحدة** ﴾ النساء:٣ ﴿ **ولن تستطيعوا ان تعدلوا بين النساء ولو حرصتم** ﴾ النساء:١٢٩. دادگەری (العدل) لەئایەتی یەکەمدا بریتییە لەدادگەری رواڵەتی (العدل الظاهری)، بەڵام دادگەریی (منفی) کە ناتوانرێ پیادە بکرێت بریتییە لەمەیلی دڵ (قلبی). ئەوەش پێغەمبەری خوا ﷺ روونی کردۆتەوە کەدەفەرموێ : (اللهم هذا قسمي فيما املك فلا تؤاخذني فيما تملك ولااملك) (رواه احمد و ابو داود والنسائي والترمزي).

٣- توانا بوون لەسەر نەفەقەدانیان: لەمەرجەکانی رێگەدان بەفرەژنی ئەوەیە کەپیاو توانای نەفەقەدانی هەموو خێزانەکانی و منداڵەکانیان هەبێت، بەڵگەش لەسەر مەرجی نەفەقەدانیان ئەمانەیە:

**یەکەم:** فەرمایشتی خوای گەورەیە کەدەفەرموێ: ﴿**ذلك ادنى الا تعولوا**﴾ النساء :٣ واتە ئەوە نزیکترین رێگەیە کەتووشی هەژاری و کەم دەستی و بێ سامانی نەبن یان.. واتە ئەمەیان چاکترە بۆ خۆ لادان لەستەم و نادادی کردن.

**دووەم:** لەبەر ئەوەی دادگەری مەرجێکە بۆ رێگەدان بەفرەژنی، جا گەر هەرکەسێك نەیتوانی نەفەقەی خێزانەکانی و منداڵەکانیان بدات وەیان نەفەقەی هەندێك

بدات ئەوانی تر نەدات ئەوە ئەمەزوڵم و ستەمەو دەبێتە قەدەغەکردنی فرە ژنی.

٤- یـەکێکی تـر لەمەرجـەکانی ڕێگـەدان بـەفرەژنی ئەوەیـە کـەنابێ دوو خوشـك مـارە بربکـات لەیـەك کـاتدا وەنابێ پووری خێزانەکەی مارەبڕ بکات.

٥- کۆ تامەرج توانا بوونی جەستەیی و تەندروستی و مـادی و عەقڵییە وەك کـە بـۆ ژن هێنـان بەگشـتی ڕەچـاو دەکـرێ وەك پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمووبـەتی: (مـن استطاع منکم البـاءة فلیـتزوج) (رواه البخـاري و مسلم و غیرهمـــا).. البـــاءة- مانـــای توانـــایی جەســـتەیی و تەندروستی و مادی و عەقڵییە.

## هۆیەکان و پاڵنەرەکانی فرەژنی

**یەکەم:** وادەبـێ کەژنەکـەی دووچـاری نەخۆشـییەکی درێژخایەن یان نائومێد لەچاك بوونەوە بێت یاز دووچاری نەخۆشییەك بێت کەپیاوەکەنەتوانێت جیماع بکات.

**دووەم:** نـەزۆکی ژنەکـە: دوای هاوسـەرگرتن وادەبـێ کەژنەکە نەزۆکـە منداڵـی نابـێ کەئەمـەش مەبەسـتێکی گـەورەی هاوسـەریەتی لەدەسـت دەدات و پیـاو لەحـەزو ئـارەزووی سروشـتی خـۆی کەوەچـەو منداڵـە بـێ بـەش دەبێت، لەم حاڵەدا دەتوانێ ژنێکی تر بهێنێ

**سێیەم:** توندی خیـلاف و کێشـەی نێـوان ژن و مێرد: کێشـەو گرفـت لـەنێوان ژن و مـێرداو ڕیشـە داکوتـانی هۆیەکە بۆ فرەژنی بەتایبەتی گەر ئەم کێشەو گرفتە هەموو هۆیەکانی ڕێگا چارەی ئاستەنگ بێت و لێی هیوا بڕ بێت کەژیانی ژن و مێرد دەبێتە دۆزەخ و لەتوانای پیاودا نابێت تەحەمولی بکات.

**چوارەم:** پیاوی وا هەیەکە بەحوکمی کارەکەی سەفەر دەکات و لەخێزانی دوور دەبێت، ناتوانێ بۆ هەرکوێیەك ڕۆیشت خێزانی لەگەڵ خۆی ببات، جائەو کاتە فرە ژنی ڕێگا چارەی ئەم حاڵەتەیە.

**پێنجەم:** هەندێ پیاو هێزی جنسیان زۆرەو بەیەك ژن هێزە جنسییەکەیان دانامرکێت، جالەم حاڵەتەدا فرەژنی دەبێتە پارێزگار بۆی لەگەڵ پارێزگاری کردنی مافەکانی خێزانەکەی تری..

# ئازادی ئافرەت لەروانگەی ئیسلامەوە

ئا: کەوسەر جوامێر

لەراسـتیدا ڕۆژانـی ڕابـردوو پێـی سـەلماندووین کـە ئاوڕێك لەژیانی ڕابردووی ئایندەی خۆمان بدەینـەوە بـۆ ئەوەی بتوانین هەندێ لەکێشەی (ئازادی ئافرەت) بخەینە سەر پەراو بەمەبەستی سوود گەیاندن بەئافرەتی کورد.

بەڵێ ئەم ژیانە ساتێکی تاقیکردنەوەیەو خەڵك پیایدا تێپەڕ دەبێت، بۆیە پیاو و ئافرەت هاوبەشن لەتێپەڕبوون بەم ساتە تاقیکردنەوە داو شان بەشانی یەك بەرپرسیارن.

بـەڵام (ئـافرەت) بەهـەڵگرتنی کۆڵێکـی تـر لـە(پیـاو) جیائەبێتـەوە کـە گـەلێك سـامناکە لـەدونیاو پاشـەڕۆژدا.. ئافرەت لەگەڵ ئەوەشداو لـەم تاقیکردنەوەیـەدا بەشـداری پیاوەو، لەهـەمان کاتدا بـەگرنگترین وانە لەوانـەکانی ئـەم تاقیکردنەوەیەشدا دادەنرێ. هەرچەندە ئافرەتانی ئـەمڕۆ لەزۆربەی زۆری بوارەکـانی ژیـانی ئێسـتادا دەوری خـۆی بەئازادانە تیایدا دەگێڕێ و کـاری دەکات وەك پزیشـکی و ئەندازیاری و مامۆستاو. تەنانەت لەکۆمپانیاکانی فیزیکی ئـەتۆمی و کیمیاگـەری و تاقیگەکانیشـدا کـار دەکـەن. هـــەروەها لـــەبواری یاســـایی و نوێنەرایـــەتی گـــەل لەئەنجوومەن و بگرە تا لەوەزیرو سەرکردایەتی ئەئەوەش بەشـدارن. بـەڵێ، ئافرەتـان ئـەمڕۆ ئـەم پلـەو پایانـەی خستمانە ڕوو بەخۆیەوە بەواقیعی دەبینن.

لێرەدا پرسـیارێك دێتـە ئـاراوەو دەڵێـین: ئایـا ئـەم بارانەی کـەئافرەتی ئـەمڕۆ دەوری خـۆی تیـادا بـەئازادی دەبینـێ، کیـانێکی نوێـی ئافرەتـە؟ کەبـەم شـێوەیە شـان بەشانی پیـاو وەك کارکـارو زانـاو ڕۆشـنفیکرو سـەرکردە کاربکات؟.

ئێمەش لەوەڵامدا دەڵێین هـەر سەربەستی و ئازادییەك سنووری تایبەتی خۆی هەیە هەروەك وتراوە: (سەربەستی



مرکەسێك دوایی دێت لەو کاتەی سەربەستی یەکێکی تر
ست پێدەکات) جا ئەگەر ئافرەت هەر چەند سەربەست و
ازاد و یەکسانی بێت لەگەڵ پیاو لەبەر چەند هۆیەکی
سروشتی و کار ئەندامی (فەسلەجی) ناتوانێت دەوری
پیاو ببینێت لە گشت بوارێکی ژیاندا. ئەمەش وا
گەینێت کەئافرەت رێك ناکەوێت تیایاندا هەڵیکەوێت و،
جەرگ و بلیمەت و ئازاد و ئازاو نەترس نەبن، بەڵکو
پێچەوانەوە ئەگەر لاپەڕەکانی مێژوو هەڵبدەینەوە
چەندان ئافرەتی ژیرو سەرکردەو نمونەی پێشڕوانمان بۆ
دەردەکەوێت لەوانە: (خانزادی میری سۆران و بەڵقیساو
حەپسەخانی نەقیب و عادیلە خان و میناخانی هاوسەری
قازی محەمەدی نەمرو قەدەم خێرو خەنساو
ئەندێراگاندی و تاچلەرو مادلین ئۆلبرایت ..هتد.

هەرچەند پرسیارێك سەبارەت بەپێشکەوتنەکانی
چەرخ لەگوێچەکەی زانایان دەزرینگێتەوە بەوەی کەئایا
ئەم ئاکارانەی گەشەکردنی ئافرەت لەگەڵ فەسلەجەی
جەستەیی و دەروونی بەیەکەوە کۆ دەبنەوە؟. بۆنموونە
لێکۆڵینەوە تازە دەروونیەکان جیاوازی بەشەکانی رەفتار
لەپیاودا بەرانبەر بەگرفتەکانی ئافرەت و ئازادی ژیانیان
هەر لەقۆناغی یەکەمی گەشەکردنەوە سەلماندوویانە
کەکچانمان لەرووی ئارەزووی لاسایی کردنەوەو
پاشکۆیەتی جیاکراونەتەوە، بەوەی کە کوڕەکان هەر
لەمناڵییەوە ئاکارەکانی سەربەخۆو ئازاد دروست دەکەن
کە لەگەڵ رەگەزەکەیان گونجاوە.. شیاوی باسکردنە ئەم
تاقیکردنەوەیە لەسەر کوڕو کچانی ئەوەی
شارستانیەتی رۆژئاوا تاقیکراوەتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا
هەر چەندە لایەنی کاریگەری رۆشنفیکری و
پێشکەوتنەکانی شارستانیەت تیایدا نابینرێت، چونکە
ئەم کاریگەریە لەسەر سروشتی فەسلەجەی ئافرەت
خۆی و. رێسا رژێنەکانی بۆ خودی خۆی دەگەڕێتەوە
هاوکات ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئاماژە رەنگینە
داهێنەرەکەی قورئانی پیرۆز کە بەئایەتێك لەئایەتە
داهێنەرە مەزنەکانی جیاوازی لە نێوان رەگەزی (نێرو
مێ‌دا) کردووە. کەئەمەش خۆی لەخۆیدا مەزنترین بەڵگەیە
لەسەر توانای خوای پەروەردگار بەرانبەر بەسنوور دانانی
(ئازادی ئافرەت)..نەك بەم شێوە بێ ئەندازەیەیی ئەمڕۆ
کەلەرێسای ئاینی و داب و نەریتی کۆمەڵایەتی گەلان
دەرچووەو بۆتە هۆی بڵاوبوونەوەی دەردێکی کوشندەی
کۆمەڵایەتی، کەگەلانیش بەم بێ سنووریەی (ئازادی
ئافرەتانی رۆژئاوا) گرفتار بووە، لەگەڵ ئەوەشدا ئاین
(مافی ئازادی ئافرەت) ناگرێت گەر لەسنووری خۆیدا
لەکارەکانی رۆژانەدا کاربکات، چونکە جیاوازی نێوان
(ئافرەت و پیاو) هەتا هەتایە، بەڵام یاساو سیستەمەکانی
بەرهەڵستکار لە گۆڕانکاری بەردەوام دان. بۆیە پێویستە
لەسەر ئەو گروپانەی (رێکخراوانەی) باس لەئازادی
ئافرەت دەکەن، دەبێت مانای بڕگەو دەقەکانی یاسای
ئیسلام بزانن و هاوکات دەشبێ لەرێبازی زانا بەرزەکانی
پێشینانمان سوود وەربگرن، چونکە ئەوان باشتر لەئێمە
مانایان زانیوەو، لەکردەوەو رەفتاریشیاندا دامەزراوتر
بوون. بەڵام ئەمە مانای وانییە ئەو کەسەی بەدوای
راستیدا بگەڕێ وێڵ و سەرگەردان ئەبێت لەنێوان
پروپاگەندەو فێڵی فێڵبازەکان.. چونکە هەرکەسێ
بەراستی بەدوای حەقدا بگەڕێ ئەوا لەژێر رۆشنایی
قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەردا ﷺ بەئاسانی حەق
ئەدۆزێتەوە ئەگەر ئەمەیشی نەتوانی ئەوا لەڕەوشت و
کردەوەی مرۆڤ باشانی رابردوودا حەق ئەناسێ و بۆی
دەرئەکەوێ ئەگەر ئەمیشی بۆ نەکرا، ئەوە دەتوانێ
لەڕەوشت و کردەوەی یەکێ لەحەق پەروەرەکانی ئەمڕۆدا.
لە شۆرەتی پاکی و خاوێنی لەنێو خەڵکیداو
لەخۆگرتنیشدا لەبەردەم تاقیکردنەوەکانی ژیانداو
ئارەزووەکانی هەواو هەوەسدا راستی بەدی بکاو
بیدۆزێتەوە.. ئەگەر بەمەبەستی هیچ لەمانە نەگەیشتە
ئەوە مانای وایە (خەتاو کەمتەرخەمی) لەخۆیدایەو نەك
لەو کەسانەدا کەخەڵکی وێڵ ئەکەن و سەریان لێ
ئەشێوێنن، چونکە ئافرەتی موسڵمانی راست ئەبێ هیچ
نەبێ تا رادەیەك ئاگاداری دینەکەی بێت و. (راست و
ناراست) لەیەك جیابکاتەوە، بۆ ئەوەی نێوانی خۆی
لەبۆچوونی (ناراست) دوورخاتەوە ئەگەر واش نەبی واتە
موسڵمانێکی راست نییەو بەراستی ملکەچی فرمانەکانی
خوا نەبووەو، کەچی واجبی سەرشانی خۆشی وەك
ئافرەتێکی (موسڵمانی ئازاد) بەجێ نەمێناوە.

سەرچاوەکان
١- ئافرەت لەقورئاندا- عبدالرحمن قادر یونس ١٩٨٨.
٢- کیژێکی خاوەن باوەڕ- عمر احمد نیزامی چاپی یەکەم ١٩٨٥.
٣- گۆڤاری (الرسالة الاسلامية) ژمارە ٩٩-١٩٧٤.



# سەعید نورەسی



# زانایەکی ئایینی و کەسایەتیەکی ناوداری مێژوویی کورد بوو

ئیحسان تاهیر مزیری

بێگومان سەربەرزییە بۆ هەموو گەل و نەتەوەیەک کە پیاوانی ناودارو بەهرەدار لە (زاناو حەکیم و رۆشنبیرو بیرتیژانی) تێدا هەڵکەوێ، وە زیاتر مایەی سەربەرزیشە کە رۆڵەکانی ئەو گەلەیان ئەو نەتەوەیە بەو پیاوانەیانەوە شانازی بکەن و نەهێڵن ناویان کوێرەوە بێت، بێگومان نەتەوەی ئیسلامیش کە پوختەی نەتەوەکانی ترە خوای پەروەردگار بەهەزاران پیاوی زاناو حەکیم و شۆڕشگێڕی تێدا هەڵخستووە. گەلی کوردیش کە لقێکی پڕ گەڵاو بەرهەمی درەختی پنج بەستووی نەتەوەی ئیسلامە، هەمیشە لەو جۆرە پیاوانەی تێدا هەڵکەوتووەو لەلاپەڕە رەنگینەکانی مێژووشیان بەهەوڵ و پێشکەوتن و سەرکەوتنی نەتەوەی ئیسلامدا لەریزی سەرەوەی پیاوانی ئیسلامدا ناویان تۆمار کراوە. جا با ئێمەش لەم دەرفەتە تەسکەدا خۆمان لەگەڵ یەکێک لەو شێرە پیاوانەماندا ئاشنا بکەینەوە کە لەباوەشی کوردستانداو گۆش کراوەوەو بووەتە هۆی شەرافەتمەندبوونی گەلی کورد بەتایبەتی و، گەلانی تری ئیسلام بەگشتی، بەوەی کە چەندەها هەڵویستی مەردانەی کردووەتە سەرمەشق بۆ گەلەکەی، ئەم شێرە پیاوەش مامۆستای پایەبەرزو زانای ئایینی موسڵمان مامۆستا سەعید نورەسی یە کە بە (بدیع الزمان) ناسراوە.

## لەدایک بوونی

جیهانی ئیسلامی لەهەلوێستێکی پڕ مەترسیدا بوو. لەلایەک رۆڵەکانی دواکەوتبوون، لەلایەکی دیکەشەوە گورگە هارەکان دەوریان دابوون، مرۆڤە دڵسۆزەکانیش چاویان بڕیبووە ئاسمان و هاواریان لەپەروەردگار ئەکرد رابەرێکی دەست و دەم پاکیان بۆ پەروەردە بکات بەبیری تیژو هەستی پاکی جیهانی ئیسلام. لەلافاوی بێ باوەڕیی و خوانەناسیی و داو تەڵەکەی دوژمنان رزگاریان بکات، ئەوەبوو لەدامێنی کێوە گەردن کەشەکانی کوردستانی تورکیا کە هەمیشە بەبەفر داپۆشراون و لووتیان لەئاسمانی شین گیر کردووە. لەگەڵ بەرەبەیاندا لەناو بنەماڵەیەکی کورد زبانی خواناسدا کوڕێک هاتە دنیا، لەگوندی (نورەس) کە دێهاتێکی بەخشداریی (ئیسپاریت)ی سەر بەقەزای (هیزان)ی سەر بەپارێزگای (بەدلیسە) لەساڵی (١٢٩٠ک-١٨٧٣ز)دا مامۆستا سەعیدی نورەسی هاتە دنیا. واتە سێ ساڵ پێش خەلافەتی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم، خوای گەورە بەخشندەیی زۆری پێ بەخشی بوو کە یەکێ بوو لەوانە لەدایک و باوکێکی زۆر خواناس



بوو. باوکی کە ناوی میرزا بوو لەبەر خواناسیی ناونرابوو (صۆفی میرزا)، بەکشتوکاڵ و ئاژەڵداری ماڵو منداڵی بەخێو دەکرد. نوریە)ی دایکیشی نموونەی دایکی ئیماندارو رۆڵە پەروەردەکار بوو. سەرجەرەش دەگەڕێتەوە سەر ناڵو بەیت، لەسەری باوکیەوە دەگاتەوە بەئیمان حەسەن و لەدایکیشیەوە دەگاتەوە بەئیمان حوسەین.

## خوێندنی مامۆستاو نازناوی (بدیع الزمان)

مامۆستا هەر بەمنداڵیی پێی خۆش بوو لەگەڵ پیاواندا دانیشێو گوێ لەوتوویژیان بگرێ، بەتایبەتی کۆڕی خوێندەوارانی گوندەکەی کە لەشەوە دوورو درێژەکانی زستاندا لەماڵی باوکی کۆ ئەبوونەوە، بەم جۆرەش خۆشەویستی زانست لەدڵی مامۆستادا رەگ داکوتاو بوو تە شەوێك لەشەوانی منداڵیدا سەعیدی بچکۆلانە پێغەمبەری بەرێزی لەخەو بینیو خۆی خست بەسەر هەردوو دەستەکانیاو ماچی کردنو دوای ئەوە داوای (زانستیی) لێ کرد پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو (زانستی قورئانت پێشکەش دەکرێت بەو مەرجەی سوئاڵ لەهیچ کەسێکی ئوممەتەکەم نەکەی).

ئەوەبوو سەرتا لەحوجرەی گوندی (داغ) سەرە دەستی مامۆستا (محەمەد ئەفەندی) لەساڵی ۱۸۸۲دا دەستی دایە وانە خوێندنو لەلای مەلا عەبدوڵڵای براگەورەیشەوە لە پشووی هەفتەدا وانەی تری وەرئەگرت. پاشان لەساڵی ۱۸۸۵دا چووە بۆ (بەدلیس) تا لەقوتابخانەی مامۆستا ئەمین ئەفەندی بخوێنێو لەوێش زۆر نەمایەوەو چووە قوتابخانەی (واسطان) لەگەواش. پاشان پەیوەندی بەقوتابخانەیەکی ترەوە کرد لەقەزای بایەزیدی سەر بەپارێزگای ئاغری (ئەرزەرۆم). ئا لەم قوتابخانەیەدا بوو خوێندنی بنەرەتیی لەژیانی مامۆستا نورەسیدا دەستی پێکرد، چونکە لەوەو پێش جگە لەوانەی (نحوو صرف) هیچیتری نەخوێندبوو، تەنانەت لەم قوتابخانەیەداو لەژێر چاودێری مامۆستا (محەمەد جەلالیی) کتێبەکانی دیکەی تەواو کردو هەر لەلای مامۆستا محەمەد جەلالیش بڕوانامەی عالمی وەرگرت.

لەساڵی ۱۸۸۹دا چووە بۆ ماردین و لەمزگەوتی (جومعە)ی شارەکەدا دەستی بەوانە وتنەوە کردو وەڵامی موسڵمانانی ئەدایەوە، لە ساڵی ۱۸۹٤دا حەسەن پاشای والی (وان) داوای لێکرد بچێتە پاڵیو لەلای بمێنێتەوە، ئەوەبوو چووە لای حەسەن پاشاو، لەوێش خوای پەروەردگار هەلی بۆ رێك

خست هەندێ لە مامۆستای زانستە تازەکان وەکو جوگرافیاو کیمیاو ئەوانی تر ببینێ، ئەوەبوو بەماوەیەکی کەم شارەزایی لەبیرکاریو گەردوون ناسییو کیمیاو فیزیاو جیۆلۆجیاو فەلسەفەو مێژوو و جوگرافیا پەیدا کردو، بەرادەیەکی وا توانی کتێب لەسەر ئەو بابەتانە بنووسێت. جا هەروەك لەزانستە شەرعیەکاندا ناوبانگی زیرەکیو لێهاتوویی دەرکردبوو لەزانستەکانی تریشدا بەهەمان شێوە ناوبانگی دەرکردبوو. تا ئەوەبوو نازناوی هەڵکەوتووی زەمانە (بدیع الزمان)ی لێندرا.

## نورەسی بەنەمەك بوو بەرامبەر بەئایینو گەلەکەی

کەم کەس وەکو نورەسی بواری تێکۆشانی چەکدارانەو سەرکردایەتی گرتنە دەستی فراوان بووە. بۆیە دوژمنانی ئەم گەلە لەهەڵوێستی ناوبردنی نورەسیدا دووچاری بێ دەنگیو شەرمەزاری بوون. نورەسیەك کە کوردستانی خۆیو تێکڕای ناوچەکانی تری پێکدا هەژاندو هەمیشە ویستی نەشتەری ئازادی بەمێشکیاندا ئەچەقاند. نورەسیەك کە بووە هەرەسێکی قورس بۆ سەر هێرشی ستەمکاران لەجەنگی جیهانی یەکەمیشداو بەپلەی ئەفسەرێکی



چـــالاك قۆڵـــی لێ هـــەڵماڵیو لەپێشـەنگی هـێزە چـەكدارەكاندا، ســـەركردایەتی گرتـــە دەســـت، بـەجۆرێك كـە ترسـی خسـتە بـەر روسـیای هێرشـكارو چەوسـێنەر. ئـەو نورەسـییەی كـە لەبـەردەم (خورشـید پاشـا)ی سـەرۆكی ئـەو دادگایـەی كـە (١٥) تێكۆشـەری هاوڕێی لەسێدارەدا، وە لەتەنیشت دەیـان ئـەندامی كۆمەڵـەی (اتحـاد وترقی)دا هەستاو گوتی:

(یـەكێك لەتاوانـەكانم ئەوەیە كە خەم بۆ ناوچە خۆرهەڵاتیەكان (واتە كوردســـتان) دەخـــۆمو داوای دانـەوەی مافـەكانی دەكـەم، وە هەمیشـە هـەوڵ دەدەم كوردسـتان بگاتەوە بەكاروانی هونەرو زانستو پێشكەوتنی راستەقینەدا)، هەر لەم دادگایـەدا مامۆستا گوتـی: (مـن هەرچەند كوڕی حەمباڵێكی هەژاری ئـەو گەلـەم، بـەڵام زۆر شـادمانم چونكـە ئـامێزی كێـوە سـەوزو رەنگینـەكانی ئـەو ناوچەیـەدا پێگەیشتووم و ئێستاش كە بەندی زیندانمو لەو كەژو كێـو هـەورازو نشـێوە رەنگینـە سـیحریانەی بێبـەشو دوور خـراوەم هـەر شادمانم. چونكە هەر چۆن بێ وێڵم بەشوێن مەلی ئاشتیو ئازادیدا، كە بیبەمەوە بـۆ ئـەو گەلـەو، لەهـەمان كـاتدا ویژدانـی زۆرداران و سـتەمكارانێكی وەكـو ئێـوە ئـەبزوێنم..!) (بـەڵێ مـن ئەمـەمو، ئەمانەشن تاوانەكانم، بۆیـە ئێسـتا لـەم دادگایـەدا وێسـتێنراوم.. جـا ئەگەر فەرمانڕەوایی ئاوابێ با بژی شێتی! بژی مـردن! بـا دۆزەخیش هـەر ئـاوەدان بـێ بـۆ زۆرداران و چەوسێنەران..!)

## نورەسی و ژیانێكی سەخت

هـەروەكو باسمـان كـرد لەبـەر ئەوەی نورەسی لەپێناو سەربەستی ئایینەكـەیو گەلەكـەیدا هـەردەم تێكۆشاوەو هەرگیز بۆ ئەم ئامانجە بەرامبەر بەهیچ ستەمكارێك چۆكی دانـەداوەو تەنانـەت هیـچ كـاتێك لەمردنیش سڵی نەكردۆتەوە، بۆیە بـەدرێژایی ژیـانی تووشـی راوەدوونـانو گرتـنو ئـازاردانو بـەندكردن بـووە، هـەر لەجـەنگی جیهانی یەكەمەوە كە لەلای سوپای روسـیاوە دەسـتگیر كـراوەو بـۆ سـیبیریا گوێزراوەتـەوە، بـەڵام توانیویـەتی لەدەستیان رابكـاتو بەرێگای ئەڵمانیاو بولگاریاو توركیا بگاتەوە ئەسـتەمبول، جگـە لـەوەی كە چەندان جار دراوەتە دادگاكانو زیـاتر لـەجارێكیش سـزای لەسێدارەدانی بـۆ دەركـراوە، بـەڵام جێبەجێنـەكراوە، لەبـەر ترسـی هەڵگیرسـاندنی شـۆرش لەلایـەن لایەنگرە زۆرەكانیەوە.

## كۆچی دوایی نورەسی

لـەدوا رۆژەكـانی ژیـانیدا لەئیسپارتە بەتەنیایی ژیاوە و (٣) رۆژ پێش مردنی چووە بۆ ئورفـەو هەر لەوێ لە ٢٧ی رەمـەزانی سـاڵی (١٣٧٩-١٩٥٩ز)دا بەیـەكجاری ماڵئاوایی لەم دونیایە كردووە.

جا خوێنەری ئازیز نورەسییەك كە ئەمە مشتێك لەخەرمانی هەوڵو تێكۆشانی بوو، وە ئەو وتە بەرزانە چـەند دێرێكی پـەراوی بۆچـوونو راكانی بوون، جا چۆن دوژمنانی ئاینو گەلەكەی دێلن ناوی ببرێو بناسرێ؟ گـەلێكی وەكـو كـورد كـە هەمیشـە نێچـیری دەم سـەگو گورگەكانی جیهان بووە، چۆن دێلن رەواج بەناوەكـەی بدرێـت؟ بـەڵام ئەوەی جێی خۆشحاڵییە ئەوەیە كە مامۆسـتا سـەعیدی نورەسـی لەدەفتـەری رەزامـەندی خـواداو لەلاپـەڕە زێڕینـەكانی مێـژووی كورددا ناوی تۆماركراوە.

**هەزاران سڵاو لەگیانی پیرۆزت ئەی مامۆستا نورەسی پایەبەرز.**

سەرچاوە:

١- الموسـوعة الميسـرة في الاديـان والمذاهـب المعـاصرة- الطبعـة الثانية- ١٩٨٩م.
٢- چـەمكێك لـەژیانی مامۆسـتا سەعیدی نورەسـی- حبیـب محمـد سعید.



# بڵاوبوونەوەو پەرەسەندنی ئیسلام لەئەمەریکادا

هیوا قادر کەریم

لەناو خاکی ئەمەریکادا، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ وشەی قورئانی باڵا دەست و پیرۆزی خوا پەرستی لەوگەشەو پەرەسەندندایەو، بەرهەمی پیرۆزی خۆی پێشکەش بەموسڵمانان دەکات. سوپاس بۆ یەزدانی مەزن (لەکات و ساتی ئەو بەڵێنە خواییە دابن کەلەسەر زاری پێشەوای مرۆڤایەتی (پێغەمبەر) ﷺ پێمان بەخشراوە کەدەفەرمووێت (قیامەت نایەت. تائەم ئیسلامە نەگاتە ئەو شوێنەی کەشەوان ڕۆژی بەسەردا دێت) ئەمڕۆ لەکیشوەری ئەمەریکادا، ئاینی پیرۆزی ئیسلام لەپەرەسەندنێکی باش و خێرادایەو. ڕێژەی موسڵمانان بەردەوام لەپتر بووندایەو، بەگوێرەی ئامارەکان. بەرەو (٨) ملیۆن مرۆڤی موسڵمان دەڕۆن کە (٤) ملیۆنیان بەرەگەز ئەمەریکین و کەنەدین.

لەچاوپێکەوتنێکدا (دکتۆر مزمل سدیق)ی سەرۆکی یەکێتی موسڵمانەکانی ئەمەریکا، تەمەنی یەکێتیەکەیانی گەڕاندەوە بۆ (٣٥) ساڵ بەر لەئێستاو وتی، لەو ساتەوە تاکو ئێستا ئاسۆیەکی گەش بەدی دەکەین بۆ داهاتووی کارو چالاکی ئیسلام لەئەمەریکادا.

هەروەها ڕایگەیاندو گوتی، کارەکانمان لەئاستێکی گونجاو بەردەوام دایەو، لەگەڵ پێویستی موسڵمانان و ئاستی شارستانیەتی ڕۆژئاوادا ڕەخساوە، کەتاکو هەنووکەش کارو خەباتی یەکێتی ئیسلامی لەبواری ڕێکخستنی کۆمەڵ و ڕێکخراوی ئیسلامی کۆبکرێتەوە، بەرهەم دارو سەرکەوتوو بووەو، توانراوە لەژێر سایەی یەکێتی ئیسلامی‌دا، چەندین گروپ و کۆمەڵ و ڕێکخراوی ئیسلامی کۆبکرێتەوە، لەوانە (یەکێتی قوتابیانی ئیسلامی و لاوانی ئیسلامی ئەمەریکی، یەکگرتووی زانایانی کۆمەڵناسی ئیسلامی، کۆمەڵەی مقەی ئەمەریکای باکور، کۆمەڵەی موسڵمانان لەسوپای ئەمەریکا، هەروەها (٢٠٠) هەزار بەندکراو لەبەندیخانەکانی ئەمەریکادا بەرادەیەکی وا، کە بەڕێوەبەرایەتی گرتووخانەکان هاوکاری کردوین تا کۆمەڵە زانایەکی کارامەو شارەزا لەبەندیخانەکاندا، دابمەزرێنین بۆ بەڕێوەبردن و چاودێریکردنی زیندانیە موسڵمانەکان.

لەم دواییانەدا سەرکردایەتی سوپای ئەمەریکی ڕایگەیاند کەزیاتر لە (١٥) هەزار پیاو و ئافرەتی ئەمەریکی لەناو ڕیزەکانی سوپادا، بوونی موسڵمانیەتی خۆیان ڕاگەیاندوە. بۆ ئەم مەبەستەش سەرکردایەتی سوپا داوای لەیەکێتی ئیسلامی کردووە، سێ زانای ئاینیی لێهاتووی شارەزا لەناو سوپادا دابمەزرێت، تاکو سەرپەرشتی سەربازە موسڵمانەکان بکەن لەم دواییانەشدا لقێکی (یەکێتی ئیسلامی) لەناو سوپای ئەمەریکیدا دامەزراوە هەروەها دروستکردن و بنیاتنانی زیاتر لە لە (٧٠٠) لقی سەر بەیەکێتی ئیسلامی لەپانتایی ڕووبەری (٥) ملیۆن میل چوار گۆشەداو لەچەند ناوچەیەکی جیاوازدا سەری هەڵداوە.

ئەمەو ڕێژەی ئەندامانی کار لەبەرزبوونەوەدان و بە (١٠) هەزار ئەندام مەزندە دەکرێت، کەچالاکانە لەکارو خەباتدان هەروەها دامەزراندنی پەرتووکخانەو ناوەندێکی ڕۆشنبیری ئیسلامی بۆ بڵاوکردنەوەی پەرتووک و چاپکردنی (٢٠٠) پەڕاوی نوێ لەبواری هەموو زانستە ئیسلامی‌یەکانداو، وەرگێڕانیان بۆ سەر زمانی ئینگلیزی. جگە لەدابەشکردن و بەچاپ گەیاندنی سەدان هەزار بڵاوکراوەو نامیلکەی ئیسلامی و کاسێتی قورئانی پیرۆزو



کاسێتی وتاری ڤیدیۆیی ئیسلامی هەروەها هاوکاری کردن لە دروست کردنو دامەزراندنی سەد قوتابخانەی یاسای شەریعەی ئیسلامیو سەدان قوتابخانەی تر کەتەنها ڕۆژانی پشووی هەفتە وانەیان تێدا دەخوێندرێ.

هاوکات دامەزراندنی لیژنەیەکی پسپۆر بۆ دانانی پرۆگرامێکی خوێندنی ئیسلامی بۆ زیاتر لەنیو ملیۆن کوڕو کچی موسڵمانی ئەمریکی، هەروەها بەگەڕ خستنی توانای چوار هەزار زاناو پزیشکی موسڵمان لەبوارە زانستیە جۆراو جۆرەکاندا، بەمەبەستی زیاتر گرنگی دان بەبڵاوکردنەوەی بانگەوازی ئیسلامی لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە، ئەمەو هاوکات لەچالاکیەکی بەرچاوو گەورەدا. توانرا لەم دوایی یانەدا، بەبەشداری (٢٢) هەزار موسڵمانو کەسایەتی ناسراوی ئایینی، کۆنگرەی سیو چوارەمی یەکێتی ئیسلامی ببەسترێ کەکۆنگرە یەکی ساڵانەیە هەر لەمبارەیەوە ڕۆژنامەی شیکاغۆ تر یبون) لەووتارێکدا، کە ڕۆژی ٢٨ی ئەیلولی ١٩٩٨ بڵاوی کردبونەوەو نووسیبووی ئیسلام ئەو ئاینانەیە کە بەخێرایی لەئەمەریکادا گەشەدەکات گومانیش لەوەدانییە کەئەو ڕاستییە دەسەلمێنێ کە گومان لەبوونی کۆمەڵگایەکی ئیسلامی لەئەمەریکادا نییەو ڕێژەی موسڵمانەکان لەئەمەریکا بەم شێوەیەیە.. ئەو ئەمەریکیانەی کەبە ڕەگەز ئەفریقین ٤٢٪ پێک دەهێنن هەروەها هندیو پاکستانیو بەنگلادیشی ٢٤٪و عەرەب ١٢٫٤٪ و مالیزیو سنغافورەو چین. ١٦٪. ڕەگەزەکانی تر ٧و ١١٪ی موسڵمانەکان پێك دەهێنن.

هەروەها ڕۆژنامەی (شیکاغۆ) بە ٥٠تا ٤٠٠ هەزار موسڵمان مەزەندە دەکات، کەئەو ژمارەیە لەژمارەی هەموو (یەهودییەکان) زیاترە هەروەها سەرۆکی پۆلیسی (شیکاغۆ) لەلێدوانێکی ڕۆژنامەوانیدا وتی، شارەکەمان هیچ گرفتێکی ئەوتۆی نیە لەگەڵ بونی ئەو ژمارە زۆرەی موسڵمانەکان کەبۆ کاری کۆنگرە لێرەن کەواتە دەشێ بڵێین پەرەسەندنو بڵاوبوونەوەو گەشەکردنێکی خێرایی ئیسلام لەسەرتاسەری ئەمەریکادا بەرپابووە.



# شارستانیەت لەنێوان ئیسلام و ڕۆژئاوادا

ئا: خەدیجە دەروێش

شارستانیەتی مرۆڤایەتی بریتییە لەو بەرهەمانەی کە لایەنە ڕۆحیو کەرەستەییو ویژدانیەکان بەسەریا ڕەنگ دەداتەوە بەمەبەستی ڕەخساندنی ژیانێکی باشترو ئاسودە، ئەم شارستانیەتە دیاردەی سیاسی و ئابووریو کۆمەڵایەتیو هزریو ئایینی خۆی هەیە

هەموو شارستانیەتیەك لایەنی جەستەییو لایەنی ڕۆحی هەیە، لایەنە جەستەیەکەی بریتیە لەدەستکەوتەکان، کارخانەکان، ئامێرەکانو هۆیەکانی ژیان، بەڵام لایەنە ڕۆحیەکەی شارستانیەت هەموو بیرو باوەڕو بەهاو ئادابو ڕەفتاری مرۆڤو تێڕوانینی بۆ ئایینو کۆمەڵ دەگرێتەوە.

شارستانیەت لەناوەڕۆکدا دەرهاویشتەی کارلێککردنی نێوان مرۆڤو کەونو ژیانە، بەگوێرەی ئەو کارلێککردنە ئەگەر ئیجابی بێت یان سلبی هەلسوکەوتی لەگەڵ دەکرێت، باوەڕ (ئیمان) پێکهێنەری یەکەمە بۆ بنیاتنانی کەسایەتی شارستانی چونکە لوتکەی چاکە خوازییەو دەبێتە هۆی قوربانیدانو کەرامەتیش دەپارێزێتو سەروەری بەدی دێنێت.

بەها ئەخلاقیەکان لەبنەماکانی کەسایەتی شارستانین، ئیسلام کوشتن (القتل)ی حەرامکرد، خراپەکاری ڕەتکردەوەو عیبادەتی سەپاندو داوای



دادوەریو چاکە خوازیشی کرد، رۆژاوا بەجیاکردنەوەی ئایین لەژیان شێوەی شارستانیەتی تێکداو شێوەیەکی رووتو قوتی پێبەخشی کەبوە هۆی (خۆ کوشتنو شلەژان).

(هەق، ئاشتی، تەقوا) بنەمان بۆ بنیاتنانی شارستانیەت، ئەو سێ بنەمایەش لەئایینی ئیسلامدا بەرجەستەو دیارە، مرۆڤیش دەپارێزێت، ئەوشارستانیەتانەی کەلەخواو بەها ئاسمانیەکان دوورن چارەنووسیان رووخانە. لەکاتێکدا رۆژاوا ژیانی نەزانینو (خورافیات)یان بەسەردەبرد، شارستانیەتی ئیسلامی لەو پەری شکۆداریدا بوو کەوا زانستەکان گەشەیان سەندو پشتیان بەنەزمونگەری بەست، بانگە وازی ئیسلامیش سەبارەت بەزانست کەبووە هۆی دەرکەوتنی پیاوانی شارستانیەت لەهەموو بوارەکاندا، موسڵمان لەکلاورۆژنەی ئاینەکەی دەڕوانێتە بوون (وجود)و هەست بەگەورەیی خوا دەکات، ئالێرەوە شارستانیەتی ئیسلامی ئامادەیی خۆی دەربڕیوە بۆ خزمەتکردنی مرۆڤایەتی بەو حیسابەی کەخەلیفەی خوایە. ئەم شارستانیەتەش خێرو خۆشی بۆ سەرجەم خەڵك دەوێتو داوای خۆشگوزەرانی دەکات.

(جەهالەت) نەزانین گرنگترین هۆکارەکانی رووخانی شارستانیەتەو دەبێتە هۆی زۆرداری هەر وەکو چۆن پرانسیپەکانی عیلمانیەت کەدەرهاویشتەی جەدەلیەتە بووە هۆی وەستانی چالاکی شارستانیەتی ئیسلامی.

بوونی بیوڕای ئیلحادی (خوانەپەرستی) کەلەکتێبو رۆژنامەو هۆیەکانی راگەیاندن دەردەکەوێت دەبنە هۆی رووخانی شارستانیەتی ئیسلامی. ئیسلام دەیەوێت پایە جیهانیەکەی بپارێزێت لەوانەیە بانگەشەی قورئان بۆ دانانی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) رەمزێکی هاوبەش بێت سەبارەت بەئیمان. باشترین ئارەزووی راستەقینە گفتوگۆ (حوار)ی شارستانیەتە، خوای گەورەش کەهەموو جۆرە رەگەزێکی داناوە نەیویستوە دژبەیەکتربن بەڵکو داوای یەکگرتنی کردووە. جیهانێتی ئیسلام وایپێویستی کردووە دەستی یارمەتی درێژ بکرێت بۆ ئەوانی تر بەمەبەستی بەدیهێنانی هاوسەنگی.

﴿ولو شاء الله لجعلكم أمة واحدة ولكن ليبلوكم في ما اتاكم فاستبقوا الخيرات﴾ ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی مرۆڤایەتی لەمیانەی کارلێککردنی یەکەڵك لەنێوان مرۆڤاکانی.

مێژووی پەیوەندی نێوان هەردوو شارستانیەتی ئیسلامو رۆژاوا چەندان ماوەی گفتو گۆو هاوکاریان بەخۆوە بینیوە هەروەکو چۆن ماوەیەکیش پێك دادان رووی داوە لەنێوانیاندا، هزرڤانانی رۆژاوا هەستیان بەبایەخی گۆڕانکاریەکانی گۆرەپانی (دەوڵەتی) کردووە پاش رووخانی (شیوعیەت)، لەبەر ئەوە هەندێکیان داوای گفتوگۆی نێوان شارستانیەتیەکان دەکات.

هەندێکیشیان چاویان بریوەتە ململانێی شارستانیەتیەکان، سەیر ئەوەیە هۆیەکانی راگەیاندن بایەخیان بەجۆری دووەم داوە. کەداوای ئەوەیان کردوە هیچ رێککەوتنێك لەگەڵ شارستانیەتی ئیسلامیدا نەکرێت بەڵام شارستانیەتی ئیسلامی بەخاسیەتی سنگ فراوانی سەبارەت بەکەونو ناسینی خەڵکانی تر دەناسرێت. (ئیسلام) موسڵمانان هاندەدات بۆ هەڵسوکەوت لەگەڵ میللەتانی تردا، لەپێناو بنیاتنانی شارستانیەتیەکی دادپەروەر بەئامانجی رزگارکردنی مرۆڤو پاك راگرتنی ویژدان.

بەڵام ئایندەی شاستانیەتی ئیسلام بەستراوە (بەبەهێزی) رۆشنبیرییەکەیەوە لەو جیهانەی کەنازاری لاوازی پرانسیپە ئەخلاقیەکان دەچێژێت. زانایانی ئیسلام بەرپرسێتی نوێکردنەوەی دەعوەتو وریاکردنەوەی ئاینیان لە ئەستۆدایە، بۆ ئەوەی کۆمەڵگای ئیسلامی دورکەوێتەوە لەپەرتەوازە بوونو ناکۆکیو، پاش رووخانی (جیهانی ماددی) جێ پێی خۆی قایمتر بکات. ئەم رێگا دورو درێژەش پێویستی بەزیاتر رێکخستن هەیەو پێشکەوتنی موسڵمانان بەندە بەگەڕانەوە بۆ ئایین بۆ ئەوەی چۆك بەدوژمنان دابدەن.

---

سەرچاوە/ گۆڤاری (المجلە/ العدد ٩٩٢ -٢٠/٢/١٩٩٩. ل٦



# بۆچی ئیسلام بوون؟!

ئا/ مەحمود عەلی وەرگێڕانی: دلێر عەبدوڵلا شێخانی

**برناردشۆ دەڵێت:**

* ئیسلام تاکە ئایینە کەخاوەن وزەیەکی بەهێزە وەگونجێت لەگەڵ هەموو گۆڕانکاریەکانی بارودۆخی ژیان، شیاویشە بۆ هەموو سەردەمێك. بەبۆچونی من محەمەد ﷺ ئەبێ ناوبنرێ بەرزگارکاری مرۆڤایەتی، چونکە هیچ دژایەتیەکی مەسیحیشی تیدا بەدی ناکرێت.

بۆیە من بڕوام وایە ئەگەر هەڵێك بۆیەکێکی وەکو ئەو بڕەخسایە کەبەتەنها دەسەلاتی ئەم جیهانە نوێیەی بگرتبایە دەست ئەوا سەرکەوتوو دەبوو لەچارەسەرکردنی گشت کێشەکان. بەشێوازێك کەبیگەیەنێ بەئاشتی و خۆشی، کەجیهان زۆر پێویستی پێی هەیە بۆیە دەتوانین پێشبینی بکەین کەبیروڕای ئیسلامی لەئایندەی ئەوروپادا پێشوازیەکی بەهێزی لێ بکرێ بەوەی هەر لەئێستاوە دەستی پێ کردووە بەناسینی کەسانێك کەئیمرۆ لەئەوروپا گوێ بیستی دەبن و ناسراون بەئیسلام بوونیان.

هەڵبەتە ئەمە تاکە بیرو بڕوایەك نییە کە برناردشۆ بۆ ئێمەی هێنابێ.. بەڵکو پێویستە ئەوە بڵێین: کەئێمە یەکێك بوو لەوانەی راستیان وتوە دەربارەی ئیسلام، لەکاتێکدا کە خاچ پەرستەکان لەرۆژئاوا هەڵمەتی هێرش بردنیان دەکردە سەر ئیسلام. چونکە ئیسلام پەیامێك وداواویەکی جیهانیە بۆ ئەوە هاتووە کەخەڵکی رزگار بکات لە تاریکیەوە بۆ روناکی.. بۆیە زۆر لەخەڵکی رێگای ئیسلامیان دۆزیەوە بێ ئەوەی بانگهێشت بکرێن.. خەڵکانێك کەجیاواز بوون لەرەنگ وناسنامەیان لەگەڵ جیاوازی کات و بۆ بابەتە کە بگەڕێوە ئەقڵی کە لەهیچ ئاینێکیان نەدەدۆزیەوە تەنها لەژێر ئالای ئاینی ئیسلامدا نەبێ.

کەچی ئەمەش رێگایەکی وئاسان نییە.. زۆر قورسیش لەسەر مرۆڤ دەروستی چونکە کاتێ لەدایك دەبێ بڕوای بەئاینی خۆی هەیە ئەمەش بەهۆی کارتێکردنی خێزانەکەی و کۆمەڵەکەی ئینجا هەڵبژاردن و گەڕان بەدوای ئاینێك کە لەناخیەوە بڕوای پێی هەبێ و بهێنێ.

بۆیە دەتوانین بڵێین راست گۆ بوو ئەو فەیلەسوفەی کە وتی: دەتوانین بەدوو جۆرە کەس بڵێین ئاقڵ ئەوانەی خوا دەپەرستن لەبەر ئەوەی بەتەواوی ناسیویانە، ئەوانەی بەلێکۆڵینەوە هەوڵ ئەدەن بەدوایدا چونکە هێشتان نەیان ناسیوە.

حاجی د. عەبدول کەریم گیرمانوسی- رۆژهەلات ناسی بەناوبانگ- کەسەرۆکی بەشی لێکۆڵینەوەی رۆژهەلات و کاروباری ئیسلامی بوو لەزانکۆی (بودابست).

تاقی کردنەوەکەی خۆی پێش ئیسلام بوونی ئاشکرا کردوو بەکورتی باسی دەکاو دەڵێت:

کاتێ خۆی ئەقڵم زۆر لەزانست دەترسا. بەلام گیانم هەرتینو بوو. بۆیە پێویست بوو دابڕوتێمەوە لەزۆر لەزانیاریەکان بۆ ئەوەی بگەڕێمەوە سەری و بڕوای تەواوی پێ بهێنم لەرێگای تاقی کردنەوە تایبەتیەکانم. پاك لەهەموو کەم و کوڕیەك کەهەڵێنجراو بێ لە ئاگری پڕ جۆش بۆ زانینی راستیەکان. وەك ئاسنی سورەوە کراو کاتێ ساردیەکی کتوپڕی ئەخرێتە سەر بۆ ئەوەی رەقەوەبێ.

هەروەها (محەمەد ئەسەد) کەرۆژنامە نوسێکی (ئەڵەمانییە). ناوی پێشووی (لیوبولد رایس) بوو. کاتێ کەئیسلام بوونی خۆی راگەیاند. بوو بەیەکێك لە بانگهێشتانی ئیسلام.



زێتر لەکتێبێکی دەربارەی ئیسلام دانا، لەوانە (الاسلام في مفترق الطرق) (الطريق الى مكة) کەدەڵی: ئیسلام ڕێسایەکی بنیات نراوەو دارێژراوە لەسەر ئەندازەو چێکاری خۆی بەوەی کەهەموو بەشەکانی گونجاوە بۆ تەواوکردنی بەشەکانی تر. کەزۆری و کەمی تیا بەدی ناکرێت بەیەک ئەنجامیش دەگەیەنێ، ئەمیش هاوتابوونێکی تەواو، بەجێگیر بوونی تەواو.

بۆ دوور بڕۆین ئەوەتا گەورە زاناو شارەزای فەرەنسی (ڕۆگێیە گارودی ئەم نووسەرە کەکتێبخانەکانی ڕۆژئاواو عارەبیەکانی ئاوەدان کردبۆوە بەبەرهەمەکانی دەربارەی مارکسیەوە.. لەم ساڵانەی ڕابردوودا ئیسلام بوونی خۆی ڕاگەیاند، پاش گەڕانی بەناو هەموو بیرۆکەو فەلسەفەکاندا، بەڵام گومڕا بووەکەی خۆی نەدۆزیەوە تەنها لە ئیسلامدا نەبێ بۆیە بوو بەیەکێک لەبانگهێشتەکان بۆ ئیسلام هەر بۆیەش لەکتێبەکەیدا بەناوی (الاسلام دين المستقبل) دەفەرمووێ:

(لا الە الا الله) ئەم جەختە گەوهەریە لەشەهادەتی ئیسلامدا هەموو ئەوانەی کەبەرەو ناشتنی بتەکان دەبات دووردەخاتەوە کە لەکۆمەڵگاکەماندا زۆر دەبێت، وەک بتی گەشەپێدەرو پێشکەوتن و کەسایەتیەکان، هەروەها وەک بتی هێزی چەک و سوپا... جا هەر یەکێ لەم قەدەغە کراوانە نیشانەو نەریتە پیرۆزەکانی خۆی هەڵگرتووە...

بۆیە مرۆڤ بەپەیوەندیەکانی خۆی بەسروشتەوە بۆی هەیە لەئیسلام فێربێت بەوەی کە ئێمە لەگەڵ سروشتدا ئاڵ و گۆڕدەکەین. هەر لەسەردەمی ڕاپەڕیندا بەگیانێکی دوژمنکاری داگیرکار، ئامانجی گەیشتن بەچەسپاندنی چەند پەیوەندیەک لەنێوانیاندا وەک پادشاو خاوەن سامانەکان. یان وەکو خاوەنێکی برسی کەویستەکانی هەرگیز تێر نەبێ لەبەکار هێنانی سامانەکەی بەبێ سنوور زانستەکانی قورئان بەتواوی جیاوازن کەدووری گەردوونی تێیدا ئاشکرا دەبێ. کەمرۆڤ لەئیسلامدا هەموو پلەکانی بوونی گەردوونی هەڵدەگرێت ﴿إنا عرضنا الامانة على السماوات والارض فأبين ان يحملنها وأشفقت منها وحملها الانسان انه كان ظلوما جهولا﴾ الاحزاب: ٧٢ هەر لەبەر ئەمەشە مرۆڤ کاتێ دەستی پێ کرد ستەمکارێکی نەزان بوو لەگەڵ ئەوەش لەسەر زەمیندا پایەی جێ نیشی خوایی گرتە ئەستۆ.

بەوەی کەپێی سپێردرا بەرپرسیاریەتی تەواو کە کێشی جیهان بپارێزێت بەبەستانی هەموو بونەوەرێک بەسەرچاوەو مەبەستەکانی. لەچوار چێوەی هەموو ڕاستیەکی بەشی نیشانەیەکی بەبوونی خوای تێدایە.

بۆچی ئیسلام بوون؟! ئەم پرسیارە وەڵامی تر دێنێتە پێشەوە. وەڵا مەکانیش ئەگۆڕێن لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی تر بەهۆی بارودۆخی تایبەتیان، بەڵام هەمووشیان ئەوەمان بۆ دووپات دەکەنەوە کەئیسلام بەردەوام پڕ خێرەو گونجاوە لەگەڵ هەموو گۆڕانکاریەک کە بەدیار ئەکەون لەسەر واقعی ئیسلام نوێدا.

لەوانەی کەئیسلام بوونی خۆیان ڕاگەیاند وەک:

* (خالد لەتیف جابا) نوسەرو ڕۆژنامە نووسی هیندی کە لەخێزانێکی دەوڵەمەند بوو بۆمان باسی چۆنیەتی گۆڕانکاریەکانی ژیانی خۆی دەکات. تا کاتێ کەئیسلام بوونی خۆی ئاشکرا کرد پاشان بوو بەیەکێک لەبانگهێشتەکان گەدەڵێت:

کاتێ مرۆڤ لەدایک دەبێ بە چەند قۆناغێک تێپەڕ دەبێ لەقۆناغی یەکەمدا دەم بەخەندە و بێ گوناه دەبێ توانای بۆن کردن و هەست کردنی بەشت دەبێ تا هەر پێنج هەستەکانی پێ دەگات. لەگەڵ ئەوەش هەست بەهەموو شتێک ناکات بەتەواوی ڕاستە شتەکان بەگشتی دەبینێ، بەڵام ناتوانێ باش و خراپ لەیەکتر جیابکاتەوە. هەروەها ژیانی مرۆڤی گیانییەوە ئەمیش هەروەها سەرەتاو منالیەتی خۆی هەیە کەلەئەنجامدا دەگاتە پلەی تەواو بوون و تەواوی گەشەکردنی گیانی ئینجا دێتەوە یادی چۆن بوو سەرەتای تەواو بوونی گیانی کە دەڵێ:

خۆشەویستیم بۆ ئیسلام شتێکی نوێ نییە. بەڵکو یەکەم چرا لەبڕوا هێنانم بە ئیسلام پێش پانزە ساڵ داگیرسا. کاتێ کە لە(میسر) بووم شارستانیەت و کەلتوری ئیسلامی گۆشەنیگای لەدەرونما جێ هێشت کەناسرێتەوە. بەتایبەتیش سادەو ساکاری کۆمەڵگای ئیسلامی کاری تێ کردم. بەهەست کردن بەخۆشەویستی مرۆڤایەتی کە لەنێوانیاندا هەیە بەمە

چرای بڕوا لەدەروونما گەشایەوە بەشێوەیەکی بەردەوام تاتوانی بەیەك جار گۆشەگیرم بکات.

پاش گەڕانەوەم لەسەردانەکەی (میسر) بۆ (هندستان)، کاتێ بەلای هەرمزگەوتێکی موسڵماناندا تێپەڕ دەبووم. هەستم دەکرد بانگدەر کاتێ بانگی نوێژ دەدا مەبەستی منە بەتەنها. بانگەوازەکەش ئەوەندە بەهێز بوو نەمتوانی خۆم بگرم لە چوونە ژوورەوەی مزگەوت و وەستان لەریزی نوێژکەران. بەردەوام بوم لەسەر ئەم کارە بۆ ماوەیەکی زۆر. پێش ئەوەی ئیسلام بوونی خۆم رابگەیێنم.

لێیان پرسی: باشە بۆچی ئایینی ئیسلامت بەباشترزانی لەهەموو ئایینەکانی تر؟

لەوەڵامدا وتی: یەکەم هۆکار کەوا سەرنجی راکێشام بەرەو ئیسلام سادەیی و راست گۆیی تەواویەتی. کە ئیسلام لەسەر دوو بنەچەی سەرەکی دادەمەزرێ. ئەمیش زۆر ئاسانە بەوەی کەپیاوێکی سەرشەقام دەتوانێ وەری بگرێ یەکەمیان ئەوەیە: کەخوای گەورە تاك و تەنیایە و بێ هاوتایە. دووەمیان: محەمەد ﷺ بەندەو نێردراوی خوایە.

هویەکی تریش کە ئیسلامە لاخۆشەویست کردم ئەمیش بیرۆکەی یەکسانییە بەوەی کەخەڵکان یەکسانن وەك دانەکانی شانە. هەر وەکو خەڵکان چۆن ئەوەستن بەگشتی لەنوێژدا بەیەکسانی لەژێر دەسەڵاتی خودا. چونکە هەموو خەڵك یەکسانن. بۆیە هیچ دروشم و پەرستگایەکی ئاڵۆزی نایەتەپێش کاتێ ئایینی ئیسلام دەگرێتە باوەش. بەوەی کە

هەردوو باڵی شەهادەت دەردەبڕی بۆ ئەوەی ببێ بەیەکێك لەموسڵمانان بۆی هەیە ئەوەی لەلای موسڵماناندا هەیە هەروەها لەسەریەتی ئەوەی لەسەریان هەیەو پێویستە.

بەسە بیزانی کەخەلیفەی پێغەمبەر ﷺ عومەری کوڕی خەتتاب رضي الله عنه کاتێ چووە ناو قودسی پیرۆز لەگەڵ خزمەتکارەکەی، ئەوانەی چاوەڕوانی بوون نەیان توانی ئیمامی عومەرو خزمەتکارەکەی لێك جیابکەنەوە، تا پرسیاریان کرد کەکامیان خەلیفەیە؟

(خالید لەتیف جابای) موسڵمان لەگفتوگۆکەی بەردەوام دەبێ و دەڵێ:

هەروەها ئیسلام توانای ئەوەی هەیە گشت پێداویستەکانی مرۆڤی نوێ دابین بکات، ئەمەی کە ئەمڕۆ جیهان پێویستی پێ هەیە برایەتی و یەکسانییە. ئەم پلەو بەهایەش کۆنابێتەوە تەنها لەئایینی ئیسلامدا نەبێت لەکاتێکدا کەدەبینین پەیوەندییەکانی خێزانی لەدەوروبەرماندا رووخاوە... دەبینین کەئیسلام هەموو مافەکانی بەئافرەت داوەو سیستەمی ژیانی هاوسەرایەتی لەسەر بنەمایەکی راستەقینە لەنێوان هەردوولا بەشێوەیەکی شیاوو گونجاو دارشتووە.

خوای گەورە یاسای ئیسلامی داهیناوە بۆ ئەوەی بگونجێ لەگەڵ سروشتی ئادەمیزاد کاتێ کەهەڵە دەکات، چونکە وەك فریشتە نییە بێ گوناە بێت. ئالێرەدا دەردەکەوێ کەئایینی ئیسلام باشترین ئایینە بۆ مرۆڤایەتی.

* ر.ل. ملحا. زانایەکی مێژووی رەگەز ناسی‌یە- بوو بەسەرۆکی بەشی ئیسلامی لە مۆزەخانەی (ئیستیوائی) لە (ئەمیستردام)). چونکە زمانە رۆژهەلا تیەکانی لەزانکۆی (لیدن) خوێندوە- بۆیە فێری زمانی عەرەبی بووە، دەربارەی ئیسلامیشیی خوێندووە وەك بەشێك لەم شتانەی کەبایەخی پێ دەدا. ئینجا پسپۆریەتی لەخوێندنی زمانی زانستەکانی (جاو)ی وەرگرتووە پاشان گەڕایەوە سەر پەیوەندی بەئیسلام. دوای ئەوەی داوای لێ کرا بەنووسینی کتێبێك بەناوی (دلیل عن الاسلام في جاوه).

دوای سەردانێکی بۆ پاکستان ئاشنا بوو بەرووە راستەقینەکەی ئایینی ئیسلام چونکە لەواقعی دا ژیا. نەك وەکو ئەوەی کەئەورووپاییەکان نووسیویانە..

بەڵام لەمەڕ ئەو پرسیارەی کە چ شتێك سەرنجی راکێشای بەرەو ئیسلام؟

لەوەڵامدا وتی: هەوڵ ئەدەم وەڵامەکەم لەشەش خاڵ کۆبکەمەوە:

١- بڕوا بەبوونی خوایێکی تەنیای خاوەن دەسەڵات، کە لەکەس نەبووەو کەسی لێ نابێت، کەسیشی لەو ناکا.

٢- پەیوەندی نێوان دروست کەرەی ئەم گەردوونەو دروست کراوەکانی پەیوەندیەکی راستەو خۆیە بۆیە موسڵمان پێویستی بەیارمەتی دەرو کەهەنوت نییە. چونکە مرۆڤی موسڵمان بەرپرسە لەکارەکانی. هەر بۆیەش هیچ گوناهێك لەجێگای کەسێکی تر هەڵ ناگرێ.

٣- سیستەمی لەیەکتر بووردن لەئیسلامدا.. هەروەك لەم وشە پیرۆزانەدا دەردەکەوێ ﴿ لا اكــره في



الدین﴾ واتە زۆری نییە لەئاییندا بۆیە موسڵمان پێویستە بگەڕێ لەراستیدا لەهەر کوێیەك بێ بیدۆزێتەوە، ڕێزیش لەباشی ئاینەکانی تر بگرێ.

٤- سیستەمی برایەتی لەئیسلام درێژەدانە بەیەکسانی مرۆڤایەتی بەگشتی دوور لە بایەخ دان بەرەنگ و روخسار و بەرەگەز و بۆچوون بۆیە ئیسلام تاکە ئایینە لەنێوان هەموو ئایینەکانی تردا کەئەم برایەی بەکردەکی بەجێ گەیاندووە یەکسانیش لەنێوان خەڵك بەگشتی دەردەکەوێ بەرانبەر بەخوا لەکاتی (ئیحرام و حەج)دا بەیەك شێوەی جل و بەرگەوە.

٥- ڕێز گرتنی ئیسلام لەئەقڵ و ماددە، لەبەر نرخ و بەهای هەر یەکێك لەم دووانە بەهۆی بوونی هەر دووکیان وەك راستیەکی چەسپاو. چونکە گەشەکردنی ئەقڵ لەمرۆڤدا لەگەڵ پێداویستیەکانی لەشیدا لەتەك یەکا ئەڕۆن بۆیە ئەبێ مرۆڤ لەژیاندا ڕێگایەك بگرێتە بەر بۆ ئەوەی ئەقڵی زاڵ بێ بەسەر ماددەیەوە، ماددەش بخاتە ژێر دەسەڵاتی ئەقڵەوە.

٦- قەدەغە کردن و دوور کەوتنەوە لەمەی و کەرەستەی بێ هۆشکەر.. لەمەوە دەتوانین بڵێین کەوا ئیسلام پێش زەمانەی خۆی کەوتووە بەپێشکەتنێکی گەورە.

* (ئیسماعیل ویسلۆ زیجریسکی) زانایەکی کۆمەڵناسی (پۆڵەندییە باوکی بڕوای بەهیچ ئاینێك نەبووە. دایکیشی خاچ پەرستێکی بەدین بووە.. هەر چەندە باوکی لە خێزانێکی سەرمایەدار بووە، بەلام رقی لەکەسانی کارنەکەر دەبووە ئەگەر سەرمایەداریش ببوایە کەچی سەربردە چاونەترسەکان و گەشتەکانی بەجیهاندا وای لەکورەکەی کرد بوو کەهەست بەکەش و هەوایێکی جیهانی بکات، بەوەی کەجیهان بەگشتی ولاتی خۆیەتی بەم شێوەیە ئیسماعیل ویسلۆ) پەیدا بوو.

لێرەدا کەوتە خوێندنەوەو لێکۆڵینەوە لەسەر ئایینە جیاوازەکان بەهۆی خوێندن و پسپۆری خۆی تا ئیسلامی دۆزیەوە لەرێگای کتێبێك بەزمانی (ئەسبرانتۆ)... ئەمەش لەکۆتایی پەنجاکان دابوو..

لەم کاتەدا بڕوای هێناو وتی: مرۆڤ تەنها لەئیسلامدا ون بوونی خۆی ئەدۆزێتەوە..

• ئیسماعیل ویسلۆ بەردەوام دەبێ و دەڵێ:

من پیاوێکی پسپۆرم لەزانستەکانی شارستانی و کۆمەڵناسی، بەراستی سەرسام بووم بەم سیستەمە کۆمەڵایەتییە کەئیسلام بڕیاری لەسەرداوە، بەتایبەتیش (زەکات و یاسای میرات و حەرام کردنی سوو خۆری و فایزو قەدەغەکردنی شەری دوژمنکاری، فەرزکردنی حەج، هەروەها رەوا بوون بەزێتر لەیەك ژن لەسنووری شەرعدا) هەموو ئەم یاسایانە زامنی رەفتارو رەوشتن لەرێگایەکی مام ناوەندی لەنێوان سەرمایەداری و سۆشیالیستی (شوعیەت)دا جا دیار کردنێکی ورد لەبەرپابوونی کێشەکانی جیهان و دانانی بناغەیەکی چەسپاو بۆ ئاشتیەکی راستەقینە. بووە بەرێگایەکی بێ هاوتا بۆ بەئەنجام گەیاندنی برایەتی لەنێوان موسڵمانان، بەجیاوازی رەگەزو نەتەوایەتی و جیاوازی زمان و شارستانیەتیان.

شەریعەتی ئیسلام بناغەیەکی پتەوی دارشتووە لەسەر دامەزراندنی چۆنیەتی پێکهاتنی هاوسەریتی، ئەم بناغەیەش لەگەڵ راستی یە کۆمەڵایەتیەکانی تر پێچەوانەنین.. بۆیە گەلێك جیاوازی هەیە لەنێوان ئەم بناغەیە لەبێ زیانی لەگەڵ سیستەمی تەنها جارێك هاوسەریەتی. بەوشێوەی نەتەوەکانی ئەوروپا بڕوایان پێ هەیەو کە چی جێ بەجێشی ناکەن و بێ وەفان لەبەرامبەریدا سوپاسی بۆ خوای گەورە کەوا رێگای راستەقینەی نیشان دام.

*(مافیز گۆلی) هاولاتیەکی ئینگلیزیە لەکۆمەڵگایەکی مەسیحی سەری هەڵداوە بەهۆی لەدایك بوونی. هەر لەمنداڵیەوە پەیوەندی کردووە بەقوتابخانەیەکی سەر بەکڵێسا، بۆیە زۆر بەجۆش بووە بۆ (مەسیحیەت)، کەوای کرد گۆرانی لێ رووبدات، ئەم کارە بوو بە سەرەتایەك بۆ بیرکردنەوە لەگەڕان بەدوای بیرو بڕوایەك کەوا لەناخیەوە بڕوای پێ هەبێ لەگەڵ پێشکەوتنی خوێندنی. وای لێ هات بێ بڕوابێ بڕوای بەهیچ ئاینێك نەما پاش خۆ دۆزینەوەی لەبەرامبەر زۆر شت کەپێی قایل نەبوو و بڕوای پێ نەدەهات، مافیز دەڵێ: پاش ئەم قۆناغە بڕیارمدا بەلێکۆڵینەوە دەربارەی هەموو ئایینە سەرەکییەکان لەجیهاندا.

دەربارەی (بوذی)م خوێندو لێم کۆڵیەوە، ئەگەر چی مەبەستی باشی هەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا پێویستی بەشی کردنەوەی درێژ هەبوو. لەهەمان



کاتدا ئاشکرا کردنی ڕێرەویشی کەم بوو. هەروەها دەربارەی هیندۆسەکانم خوێندەوە کەچی بینیم لەم ئایینە سەدان شت خوامە نەوەك سێ خوا بەتەنها وەك هیندۆسەکانم بڕوایان پێی هەیە هەر یەکێکیشیان چیرۆکێکی ناراستی سەیری هەیە، بەراستی نەمتوانی بەم ئایینە قایل بم.

دەربارەی جولەکەکانیشم خوێندەوە لەکتێبی (العهد القديم) لەمەوە بۆم دەرکەوت کەوا بنەماکانی کەمن پێویستە ئەم بنەمایانە لەئایینێدا هەبێت دەربارەی زانستی- رووحانییەکانم - خوێندەوە ئەویش هەر بێ سوود بوو.

ڕۆژێکیان یەکێك لەرۆژنامە ناو خۆییەکان ڕیپۆرتاژێکی بلاوکرد بۆوە، بۆیە لەسەر ئەم ڕیپۆرتاژە وەلامێکم نووسی کەرەخنەم گرت لەخوایەتی (مەسیح) هەروەك لەئینجیلدا هاتووە ئەمە بووە هۆی ئەوەی هەندێ لەخوێنەواران پەیوەندیم پێوەبکەن، لەوانە برایەکی موسڵمان بوو ... سەرەتای خۆناسینم پێی بووە سەرەتای ناسینی و لێکۆڵینەوە دەربارەی ئیسلام، وتووێژمان دەربارەی هەر لایەنێکیان بکردایە، هەستم دەکرد ویستەکانم لەناو دەچوون لەبەر پەچ دانەوەی ئینجا دەستم کرد بە خوێندنەوەی قورئان، سەرەتا نەمتوانی تێی بگەم، بەلام هەستم کرد کەم کەمە کار لەدڵم دەکات. لەگەڵ ژیانی ڕۆژانەمدا بووە بەشێك و لێم جیانەبۆوە، لەم کاتانەدا زۆر پرسیار لەناخمدا نەخولانەوە... لەوانە: بۆچی پەیام بۆسەر پێغەمبەرانی ئەم سەدەیە نابێت؟ وەلامەکەش لەقورئاندا هەبوو کەمحەمەد ﷺ کۆتایی پێغەمبەرانەو دوانێردراوە.

لەبارەی زێتر لەیەك ژن هێنان پرسیارێك لەبەردەمما هەڵ ئەچوو.. بۆچی؟ برادەرەکەم لەئایینێدا وەڵامی دامەوەو وتی: زێتر لەیەك ژن لەئیسلامدا لەسنورێکی دیاری کراودا هاتووە، بەڵکو چارەسەرێکیشە بۆ ئەوەی کەئیمرۆ دەیبینین لەرۆژئاوادا لەزێدەرۆیی پەیوەندی (جنسی)بەنەهێنی بەڵگەش لەسەر وتەکانی چەند ڕیپۆرتاژێك بوو کەوا لەرۆژنامەکاندا بلاو کرابوونەوە کەکەمی ژمارەی ئەو کەسانەی دیاری دەکرد کە (قەناعەتیان) بەیەك ژن هەیە لە (ئینگلتەرادا) بەلام لەئیسلامدا نییە کە بە زۆر زێتر لەیەك ژن بهێنێ، تەنها لەکاتێکدا دەبێت کە پێویستی ژیان داوای لێ بکات.

لەبرادەرەکەم پرسی: ئایا بۆچی لەرۆژێکدا نوێژ پێنج جارە؟ بێ گومان تەنها لاسایی کردنەوەیەکی ئاساییە کەهیچ مانایەك نابەخشێت! بەلام وەلامەکەی زۆر بەهێزو یەك لاکەرەوە بوو بۆ پرسیارەکەم وتی: ئەی چی دەڵێی دەربارەی ژەنین لەسەر ئامێرێکی مۆسیقا؟ ئایا هەموو ڕۆژێك نیو کات ژمێر بەبەردەوامی کات بەسەر نابەیت لەژەنینی پارچە مۆسیقایەك جا کارت تێ بکات یان نا؟ بێگومان چێژو جوانییەکەی ون دەبێ ئەگەر بوو بەنەریتێك بەتەنها بۆیە بیر کردنەوەمان لەمانەی ئەنجامی ئەدەین کار لێکردنمان قوڵتر دەکات هەروەها مۆسیقا ژەنینی بەبێ بیرکردنەوە کاریگەرترە لەوەی کەمۆسیقا نەژەنی، بەم شێوەیەش سەبارەت بەنوێژ.

مافیز وتی: بەراستی بەراوردو بەڵگەکانی زۆر بەهێزو یەك لاکەرەوە بوو بۆم، هەر کەسێك مۆسیقا بخوێنێ ئەم ڕاستییە ئەزانێ... بەتایبەتی ئەگەر زانیمان کەوا نوێژ لەئیسلامدا کەس سوودی لێ وەرناگرێت تەنها ئەو کەسە نەبێت کەچی بەجێی دەکات. چونکە خوای پەروەردگار پێویستی بەکەس نییە.

لێرەدا دڵم دەستی کرد بەخورپەکردن بۆ ڕاستیەکان، پلە بەدوای پلە... بۆیە بڕوا هێنانم بەئیسلام ڕاگەیاند.. ئەوەك بەهۆی سۆزێکی کاتی- بەڵکو بەبڕوا هێنانێکی تەواو خوێندنەوەیەکی هۆشیارانەی دوورودرێژ.

بەڵێ: بەهۆی ئەوەی کەئایینی پیرۆزی ئیسلام خوای پەروەردگارە کە بۆ ئێمەی پەسەند کردووە ﴿ ورضيت لكم الاسلام دينا ﴾... کەئاینێکی گونجاو تەواوە لەهەمو بارێکەوە.. زانستی و کۆمەلایەتی و هەروەها دادپەروەری و ئابووریەوە...

بۆیە ڕۆژ بەدوای ڕۆژ لەبلاوبوونەوەو گەشەکردن دایە. نووری ئیمان هەموو دڵە تاریك و بێ بڕواکان ڕووناك دەکاتەوە، تاوای لێ هاتووە لەولاتانی ڕۆژ ئاواو ئەمەریکادا ڕابونێکی ئیسلامی سەر هەڵبدا.

---

سەرچاوە: گۆڤاری الكويت، ژمارە ٩٢ ساڵی١٩٩٠



# یەکسان بوونی کاتو شوێنو کاراکتەرەکانی نێو چیرۆکی (پیاوە باوەڕدارەکەی گەلی فیرعەون) لە جۆرەکانی گێڕانەوەدا

شێخ عومەر عەبدولڕەحمان

پادشایەك هەیە پادشایەکی نادادو گومڕا، وەزیرێکی یاوەری مشوور خۆرو پیاوێکی دەوڵەمەندی باش دەوڵەمەندو کۆمەڵێك دارو دەستەی پاسەوانی پادشاو کۆشك، هەروەها پیاوێکی هەڵبژێردراوی پاك نامەو بەڵگەو نیشانە پێدراو، هەروەها پیاوێکی تری پەیڕەوکاری نامەو بەڵگەکەش، لەگەڵ میللەتەکەی پادشا بەگشتی.. ئەمانە بەگشتی کاراکتەری چیرۆكو ڕووداوێکن و پڕن لەحیوار.

هەموو گوێگرتنێ لەهەر چیرۆكو ڕووداوو بەسەر هاتێ کەپێمان دەگات بەدوو جۆر دەکەوێتەوە

١- گوێگرتنێك لەکەسێکەوە، پێمان بڵێت ئەم وای گوتو ئەو وای گوت، ئەوی تر وای کردو ئەمی تر وای لێ کەوتەوە.. ئەم جۆرە گێڕانەوەیە لەلایەك کەمتر دەتباتە نێو ڕووداوەکانو لەلایەکی تر پەردی نێوان زەمەنی تۆو زەمەنی چیرۆکەکە دوور دەخاتەوە

٢- گوێگرتنو بۆ گێڕانەوەیەك لەکەسێکەوە یان لەکتێبێکەوە یان لەنمایشێکەوە بۆمان بەرچاو یان بەرگوێ بخرێ بەڵام وەك ئەوەی خۆت لەناو ڕووداوو چیرۆکەکە بیتو وەك ئەوەی کەس شتێکت بۆ ناگێڕێتەوەو خۆت گوێگرێکی ئامادەو ڕاستەوخۆی ناو ناسەکەی، لەمەیاندا زەمەن لەنێوان تۆی گوێگرو چیرۆکەکە وەستێنراوەو شوێنەکەش هاوشانو جووتو یەکسان، بۆیە زۆر جار لەمەیاندا بەناخۆشی (کاتو حاڵەت)ی ڕووداوەکە دڵتەنگ دەبیتو بەخۆشیو سەرکەوتنی بەسەرهاتەکەش دڵگەشو شاد..

ئەمە تەنها پێشەکیەك بوو بۆ ئەوەی پتر بچینە نێو باسەکەوە کەخوای گەورە لەقورئاندا دەیگێڕێتەوەو بەهەموو جۆرەکانی گێڕانەوەش چیرۆکەکەمان بەرچاوو گوێ دەخاتو نمایشەکانمان بۆ بەجوولە دەخات.. جا ئەگەر چیرۆكو ڕووداوەکە کەسدار بکەینەوە ئەوا دەگوترێ پادشاکە (فیرعەون)ەو وەزیرەکەش (هامان)و، پیاوی هەڵبژێردراوو پاكو بەڵگەو نامە پێدراوەکەش (موسا)یەو، هەروەها باش دەوڵەمەندەکەش (قارون)ەو، پیاوی پەیڕەوکاری بەڵگەونامە پێدراوەکەش بەم جۆرە ناوی لەقورئاندا هاتووە (بڕوا دارەکەی کۆمەڵی فیرعەون)، گەلەکەش گەلی فیرعەونە.. بەنی ئیسرائیلە..

سەرەتای چیرۆکەکە وا دەست پێ دەکات:

﴿ **ولقد ارسلنا موسى بآياتنا وسلطان مبين* الى فرعون وهامان وقارون فقالوا ساحر كذاب** ﴾[١].

خودای گەورە دەفەرموێ: ئێمە موسامان بەکۆمەڵێ نیشانەو بەڵگەی ڕوونەوە ناردە لای فیرعەونو هامانو قارون، ئەمانیش گوتیان لەنیشانەکانیا ساحیرو لەبەڵگەکانیش درۆزنە... ئەمە سەرەتای دروست کردنی چیرۆکەکەیە کەبەپێناس دەست پێ دەکات، بەبێ ئەم سەرەتاو دەست نیشانکردنی کەسایەتیەکانی وەك (موسا) پێغەمبەرو پادشا (فیرعەون)و وەزیر (هامان)و باش دەوڵەمەند (قارون) چیرۆکەکە دانامەزرێو حیوارەکانیش دروست نابن کەئەسڵی بابەتەکەیە، دواتر دەفەرموێ:

﴿ **فلما جاءهم بالحق من عندنا قالوا اقتلوا أبناء الذين**



**امنوا معه واستحیوا نساءهم وماکید الکافرین الا فی ضلال ﴾**[٢].

ئەوەی لەناوەڕۆکی ئایەتەکە دەردەکەوێ ئەوەیە خوا دەفەرموێ کاتێ موسا بەدینی هەق و ڕاستی هاتە لایەن (لای قەومەکەی)، گوتیان واتە (فیرعەون و هامان) بەدارو دەستەکەی خۆیان گوت بڕۆن مندالآنی (بەتایبەت کوڕانی) ئەو کەسانە بکوژن کەبڕوایان بەموساهێنانە (کەئەمەش دەلیلە لەسەر ڕاستی بەرنامەکەی موسا (علیه السلام)، جا کاتێ خەڵکانێکی زۆر باوەڕیان پێی هێنایە بەنیشانەو بەڵگە ڕوونەکانی و دواتر هەواڵ گەیشتۆتە کۆشکی فیرعەون و ئەمیش لەتەخت و تاراجی حوایەتی خۆی ترساوەو گوتوویەتی بڕۆن ئەوانە بکوژن هەروەها بڕۆن ئافرەتەکانیان بهێڵنەوەو بیان کەن بەخزمەت کاری خۆتان و بەژنی ناشەرعی خۆتان، بەلام پیلان و فێڵی لەخودا یاخییان مایە پووچ و بێ هودەو شێواو بارە، (ئەم شێوە گێڕانەوەش هەردوو جۆری گێڕانەوەی گرتۆتەخۆ، لەلایەك لەجیاتی کەسایەتیەکان قسەو کردار دەکرێ و لەلایەکی تریش کەسەکان خۆیان قسەو ڕەفتارەکان جووڵەدار دەکەن بەنموونە لەبەشە ئایەتی ﴿ **فلما جاءهم بالحق من عندنا** ﴾ ئەم گێڕانەوەیە کەخوای بەتوانا بۆ ئێمە باس دەکات وەك ئەوە وایە خوای بینەر چاودێری نمایشەکان و قسەکان بکات و دواتر بۆ ئێمەی بگوازێتەوە کەئێمە نەتوانای گوێ گرتنمان لەقسەکان هەبێت و نەتوانای بینینی کاراکتەرەکانی ئەوانیشمان هەبێت، وەك ئەوەی دیوارێك لەنێوان ئێمە (گوێگر)و ئەوانی کەسایەتیەکانی نێو ڕووداو هەبێت. بەلام دواتر کەدەفەرموێ فیرعەون و دارو دەستەکەی وتیان:(قالوا) واتە ئەوان بڕیاریان دەرکرد، کەئەمە قسەکردنێکی ڕاستەوخۆیە ئەگەر بەئوسلوبی گێڕانەوەش بێت ﴿ **اقتلوا ابناء الذین امنوا معه واستحیوا نساءهم** ﴾ ئەلێرەوە گێڕانەوە کە دەبێتە گێڕانەوەیەکی ڕاستەوخۆو ئێمەش یان دەبینە کەسانێکی نێو ڕووداوەکان یان گوێگرێکی نزیکی پشت دەرگەی کۆشکی فیرعەون کەبەجەندرمەکانی دەڵێت بڕۆن کوڕو منالآنی ئەو کەسانە بکوژن کەئیمانیان بەموسا هێنایەو ئافرەتانیشیان ئەتك بکەن. دواتر دیسان ئێمە دوور دەخرێینەوە لەگوێ بیستن و نازانین ئایندەی ڕووداوەکە بەچی و کوێ دەگات بۆیە خوای گەورە وەك گێڕەرەوەیەکی پاك و شارەزا دەفەرموێ پلانی کافران مایەپووچەو بێ هودە دەبێ.. دووبارە ئێمە گوێگرێکی ناڕاستەوخۆین لەم بەشە ئایەتەو بەسایەی ئاماژە دەنگێکی تر کە(خوای پەروەردگارە) دەتوانین لەڕەوڕەوەی ڕووداوەکە بگەین، پاشان دەفەرموێ: ﴿ **وقال فرعون ذرونی اقتل موسی ولیدع ربه إنی اخاف ان یبدل دینکم أو أن یظهر فی الارض الفساد** ﴾[٣]. دیارە دوای ئەوەی کەخەڵکێکی زۆر موسڵمان بوونەو بەدوای موسا کەوتوونەو هەڕەشەی فیرعەون و داروودەستەکەی کاری تێنەکردوون بۆیە فیرعەون دەیەوێ ڕێگایەکی تر بگرێتە بەر بەوەی دەڵێ لێم گەڕێن (بەواتە بڕیارم بۆ بدەن بەهەقیانەتی جووڵانەوەم بۆ کوشتنی موسا) بەواتا ئەم ڕوو تێ کردنەی لەگەڵ (هامان و پیاو ماقووڵانی خۆیەتی) تا موسا بکوژم و ئەویش بانگی خودا کەی خۆی بکات چونکە دەترسم ئەو پیاوە دینەکەتان (کەدینی عیبادەت کردنی پادشایان بوو و لەباوك و باپیرانیانەوە بۆیان بەجێ مابوو) بگۆڕێ و بەمەش ئاژاوەو فەساد لەزەوی بکەوێتەوە.. تەماشای ئەم مەشهەدە بکەین دەبینین خودای مەزن ئەمجارەیان کەمترین ماوەی لەگێڕانەوەی ناڕاستەوخۆ (نسبەتەن بەئێمە) گرتۆتە بەر بۆ گەیاندنی ڕووداوەکە بەئێمە، ماوەکەش تەنها ئەوەیە کەدەفەرموێ (وقال فرعون) تەنها پێمان دەڵێ:(هەروەها فیرعەون گوتی) بەمە سەرنجی ناڕاستەوخۆییمان ڕادەکێشێ بۆ نموونەی نێوباسەکە بەلام ئەگەر ورد بینەوەو تەماشای بەشە ئایەتەکەی تری پشتی بکەین بۆمان ڕوون دەبێتەوە کەخودا ئەم (وقال فرعون)ەی تەنها بۆ ئەوە گوتووەو کردوویەتیە ناڕاستەوخۆ تا بەهۆیەوە یەکسەر بچینە (ئێمەی گوێگر) نێو کۆشکی فیرعەون و گوێ لەبڕیارەکەی بگرین، دیارە ئەمەش هەر لەخودای کار تەواو دەوەشێتەوە کەبەدوو وشە دەستنیشانی (شوێن- کۆشکی فیرعەون) بکات بێ ئەوەی باسی شوێنیش بکات وەك ئەوەی ناو بهێنێ یان گێڕانەوەیەکی پێناسداری ئەنجام بدات. ئەگینا بەشەکەی تر کەلە(ذرونی..) دەست پێ دەکات هەمووی قسەکردنێکی ئاشکراو ڕاستەوخۆیە کەشوێن واتە (ئێرەو)، ئەوێ واتە (میسر) هاویەك دەبن و ئێمەو ئەوانیش تێکەڵ بەیەك دەبین. هەم ئێمە دەبین بەتاکی



گەلەکەو هەمیش فیرعەون دەبێت بەپادشای ئێمە، لەدوای ئەوەدا موسا وتی: ﴿ وقال موسى إني عذت بربي وربكم من كل متكبر لايؤمن بيوم الحساب ﴾[٤]. ئیدی دوای ئەوەی کات بەیەك کراوە لەنێوان ئێمەی گوێگرو ئەواندا خوا دەفەرموێ موسا وتی (ئەمەش تەنها بۆ ناساندنی کەسی قسەکەرە لەچیرۆکەکەدا وەنەبێ بۆ ناراستەوخۆ کردنەوەی گێڕانەوەکە بێت لەنێوان ئێمەو خوێندا (سبحانە وتعالى) موسا وتی ئەمن خۆم پاراستووە بەخودای خۆم و ئێوەش (دەشێ ئەم قسەیەی موسا لەنێو خەڵکی گوتبێتی لەدەرەوەی کۆشك) هەروەها دەشێش لەناو کۆشك کردبێتی و (وربکم) لەگەڵ خودای هەقیقەتی فیرعەون و داروودەستەکەی بێت.. گوتی خۆم دەپارێزم لەهەموو کەسێ کەتەنها خۆی پێ گەورە بێت و باوەڕی بەڕۆژی لێ پرسینەوە نەبێت.. بەمەش ئێمە دەبین بەکاراکتەری ئامادەبووی نێو کۆشك (کەهێمای شوێن جووت بوونی ئێرەی ئێمەو ئەوێ بەواتا "میسر"ی ئەوانە، لەکاتێکیشا کەموسا قسە دەکا بەواتا لەهەنووکەیی کاتی ڕووداوی هەردوولاماندا هەر موسایە قسە دەکا ئەمەش بەیەکسان بوونی کاتە لەنێوان (رابردوو ئێستا).. لەدوای ئەم حیوارەدا خودای بەدەسەڵات دەفەرموێ: ﴿ وقال رجل مؤمن من ال فرعون يكتم إيمانه ﴾[٥]. ئەمە پێناسەیەکە خودای کار بەجێ بۆ ئێمەی دەکا وەبێ ئەگەر پیاوەکەمان بینی یان گوێمان لەدەنگ و قسەکانی بوو بزانین ئەوە پیاوێکی باوەڕداری نێو کۆشکی فیرعەونەو شوێن کەوتەی موسایە (علیه السلام) کەباوەڕدارێکی سر قایمو بەهێزەو باوەڕەکەی خۆی شاردبۆوە لەنێو کۆشکی فیرعەوندا، کەدەشێ بەفەرمانی موسا لەوێ جێگیر بووبێ و مابێتەوە.. پیاوە دەڵێ: ﴿ أتقتلون رجلاً ان يقول ربي الله وقد جاءكم بالبينات من ربكم ﴾[٦]، دیارە ئەم پیاوە وەك چۆن باوەڕەکەی شاردبۆوە ئەوهاش قسەکانی شاردبۆوەو بەپارێز قسەی دەکرد بەڵام قسەکانی ناراستەوخۆیەکی زۆر کاریگەر بوون بۆ یەکێك کەهۆشمەندو دڵ نەرم بووبێ دەڵێت:(ئایا ئێوە دەتانەوێ پیاوێك بکوژن تەنها لەسەر ئەوەی دەڵێ(الله) خودامە؟.. کەئەمەش هێمایە بۆ ئەوەی کەئەی خەڵکینە شتێکی زۆر ئاساییە ئەگەر خودایەك هەبێت ناوی (الله) بێت و فیرعەون خوداتان نەبێ... دوایی خۆ ئەو پیاوە بەواتا موسا بەکۆمەڵێك بەڵگەی ڕوون قسەکانی خۆی راست پارێز دەکا.. (ئەمەش هێمایە بۆ ئەوەی ئەی خەڵکینە لەمەولا بەدەلیل باوەڕ بێنن ئەگەر نا باوەڕ مەکەن، ئەوەتا موسا بەڵگەی حاشاهەڵنەگری پێیە بەڵام ئایا فیرعەون هیچ بەڵگەیەکی پێیە لەسەر ئەوەی دەڵێ (من خوای گەورەتانم)، پاشان پیاوەکە دەڵێ:

﴿ وان يك كاذباً فعليه كذبه وان يك صادقاً يصبكم بعض الذي يعدكم إن الله لايهدي من هو مسرف كذاب ﴾[٧]، پیاوەکە دەڵێت ئاگاداربن خودای گەورە ڕێنوێنی یەکێك ناکات زیادڕەوو زۆر بڵێ و درۆزنیش بێت لەقسەکانیدا.. کەئەمەش هەم هێمایە بەوەی کەئەمن (پیاوە باوەڕدارەکە) زۆر چاك خوا دەناسم و دەزانم کەخودا پشتی کەسێك ناگرێ درۆ بەسەر خوداو خۆی و خەڵك بکات، وەهەمیش هێمایە بەوەی کەئەی خەڵکینە خۆ فیرعەون خودا نییە بەڵکو (الله) خودایە کەرێنیشان نادات بەکەسانێ زیادڕەوو درۆزن بن... ئەمەش ڕێ نیشان دانی خەڵکەکەیە ناراستەوخۆ بۆ جودا کردنەوەی خودای حەقیقی کە(الله)یەو زیادڕەوو درۆزنی خۆ بەخوازان کە(فیرعەونە)، دیارە ئەمەش بانگ کردن و دەعوتکردنێکی سەرکەوتوو بووە لەجیاتی موسا.. هەمدیسان دێتەوە گوتن و دەڵێت: (یاقوم) کەئەمەش هیچ پەردەو دیوارێك لەنێوان ئێمەی گوێگرو ئەواندا ناهێڵێ و کات و شوێن دەبن بەیەك و وەك ئەوەی بەئێمەش بڵێ ئەی خەڵکینە: ﴿ لكم الملك اليوم ظاهرين في الارض فمن ينصرنا من بأس الله إن جاءنا ﴾[٨]. ئەمڕۆ تەخت و تاراج بۆ ئێوەیە بەڕووکەشی لەسەر زەوی (ڕووکەشیش هێمایە بۆ مایەپووچ و بێ هودەیی و کەم ماوەیی) ئایا کێ هەیە دەربازمان بکات لەئازارو تووڕەبوونی خودا (الله) ئەگەر بۆمان هات، ئەمەش ناراستەوخۆ بانگ کردنی خەڵکەکە ئەی خەڵکینە ئەگەر بێت و باوەڕ بێنن و موسا (علیه السلام) بەڕاست نەزانن و خودا (الله) نەپەرستن و وانەکەن ئەوا عەزابی خودا بەسەرتانا دەڕژێ و لەناو دەچن و منیش لەگەڵ ئێوەم.. هەروەها هێمایەکیشە بۆ نزیك بوونی تێك و پێك شکانی تەخت و تاراج و لەناوچوونی پادشایەتی فیرعەون.. پێدەچێ ئەم گفتوگۆیەی نێوان پیاوە باوەڕ دارەکە وگەلەکەی لەدەرەوەی کۆشك کرا بێت، یانیش لەناو



کۆشك بێ ئامادەبوونی فیرعەون چونکە فیرعەون هیچ ترس و هەڕەشەیەکی بۆ سەر ئەم پیاوە نەبووە. لێرەوە چێن چێن و کۆمەڵ کۆمەڵ بۆ گفتوگۆکان پەیدا دەبێ بەوەی فیرعەون گەلەکەی کۆدەکاتەوە لەکۆشککی و پێیان دەڵێت:(قال فرعون) کەئەمەش خودای گەورە هێمامان بۆ دەکات بەکۆکردنەوەی خەڵك لەلایەن فیرعەون و گواستنەوەی حیوار لەشوێنێکەوە کەدەرەوەی کۆشکە بۆ شوێنێکی تر کەناو کۆشکە، فیرعەون وتی:﴿ ماأریكم إلا ماأرى وماأهديكم إلا سبيل الرشاد ﴾[٩]، وتی من باوەڕتان بەشتێك پێ ناهێنم کەبەخۆم باوەڕم پێی نەبێت و هەروەها ڕێنوێنیتان ناکەم بۆ شتێکیش کەرێنوێنیی نەبووم بۆی و هەروەها ڕێنوێنی و چاوساغی ژیان و ڕێگاشتان نابم ئیللا مەگەر ڕێگای ڕاست نەبێت... دواتر کە گفتوگۆی ناو کۆشك تەواو دەبێ پیاوە باوەڕدارەکە لەگەڵ خەڵکەکە دێتە دەرەوەو پێیان دەڵێت: ﴿ وقال الذي امن ياقوم إني أخاف عليكم مثل يوم الاحزاب ﴾[١٠]، ئەمەش هەمدیسان خودای گەورە دەیەوێ حیوارەکەو شوێنی گفتوگۆ کە لەکەس و شوێنێکەوە بگوازێتەوە بۆ کەس و شوێنێکی تر بەواتا لەنێو کۆشك و لەفیرعەونەوە بۆ دەرەوەی کۆشك و پیاوە باوەڕدارەکە بۆیە دەڵێ:(وقال الذي امن) واتە پیاوە باوەڕدارەکەش گوتی ئەی گەلەکەم ئەمن ترسم لێتان هەیە تووشی سزای خودا بێن وەکو گەلە پێشووەکان. ئەمەش هێمایە بۆ شارەزابوونی پیاوە باوەڕدارەکە لەدین و لەمێژووی مرۆڤایەتی و گەلانی پێشووش، هێماشە بۆ ئەوانەی کاری بانگخوازی دەکەن دەبێ ئاوا هەمیشە لەهەموو بوارەکانی دین ئاگادار بن.. واتە ئەی خەڵکینە ئەگەر بەقسەی فیرعەون بکەن کەدەڵێ ئەمن ڕێی ڕاستتان نیشان دەدەم (کەراست نییە)و بەدوای (موسا) نەکەون بۆ خواپەرستی کەدینێکی هەق و ڕاستە ئەوا دوور نییە خودا سزاتان بۆ بنێرێ وەکو :﴿ مثل دأب قوم نوح وعاد وثمود والذين من بعدهم ﴾[١١]، وەکو سزا هاتە سەرگەل و هۆزی نوح و عاد و ثەمود بەهۆی خووڕەوشت و عادەتەکانیان کەئەمەش هێمایە بۆ چڕی خراپەکانیان (گەلی فیرعەون)و نزیك بوونەوەی سزاو خۆموستەحەق کردنیان بۆ عەزاب.. بەواتا ئەی هۆزەکەم ئەو خوو ڕەوشت و عادەتانەی ئێستاتان شیاوە بۆ تووڕە بوونی

خودا (الله)و ناردنی سزا بۆ سەرتان: (وما الله يريد ظلما للعباد)[١٢]، بەواتا خودای گەورە نایەوێ ستەم لەبەندەکانی بکات و حاشا بەبێ هۆ سزای هیچ گەل و هۆزێك نادات مەگەر گەل و هۆزەکە خۆیان شیاوی سزاو تۆڵە سەندنەوە بکەن.. لەپاشان پیاوە باوەڕدارەکە وتی: (وياقوم إني أخاف عليكم يوم التناد)[١٣]، دیسان لێرەوە هیچ پەردەو دیوارێك کەپەیوەست بێت بەکات و شوێن لەنێوان ئێمەی گوێگرو ئەوانی گەلی فیرعەون نامێنێ و ئێمەش دەبین بەبەشێك لەهۆزەکەو گوێگر دەبین لەپیاوەکە کاتێ دەڵێ ئەمن لێتان دەترسم لەڕۆژێك لەتەنگانەدا هاوارو بانگ لەیەکتر دەکەن و دەنگیشتان بەکەس ناگا، هەروەها:﴿ يوم تولون مدبرين مالكم من الله من عاصم ومن يضلل الله فما له من هاد ﴾[١٤]، بەڵێ دەترسم لەڕۆژێ کەپشت تێك دەکەن و هەر بابایە هەڵدێت و ڕادەکات کەهیچ پەناگەیەکیش شك نابەن بۆ خۆتان لەلایەن خوداوە ئاوهایە ئەوەی خۆی شیاوی ئەوە بکا کەخودا گومڕای بکات ئەوا قەت ڕێنوێنی بۆ نابێ.. ئەمەش هێمایەکە پیاوەکە بەحوکمی شارەزابوونی لەمێژووی مرۆڤایەتی و دینەکەی خۆی ئایندەی کەسانی لەخوا یاخی و لەڕێ لادەرانی زانییوە کەتووشی چ فەوتان و قوڕ بەسەرییەك دێن، بەوەندەش ناوەستێ و نموونەی پێغەمبەرێکیان بۆ دێنێتەوە (یوسف) کەدەڵێت:﴿ ولقد جاءكم يوسف من قبل بالبينات فمازلتم في شك مما جاءكم به حتى اذا هلك قلتم لن يبعث الله من بعده رسولاً كذلك يضل الله من هو مسرف كذاب﴾[١٥]. بەهەقیقەت یوسف (عليه السلام) بەر لەئێستا بەبەڵگەی ڕوونەوە هاتە لاتان کەچی ئێوە هەر شك و گومانتان هەبوو لەوەی کەپێغەمبەر بێ و ئەگەرچی بەڵگەداریش بوو هەتاکو مرد ئینجا وتتان خودا پێغەمبەری تر ڕەوانە ناکات بۆ ئێمە بۆیەش خودا خەڵکانی زیادڕەوو قسەکەری بێ بەڵگەو شك هێنەرەوە گومڕا دەکات.. ئەم جۆرە گێڕانەوەیش کاری خودای کار بەجێیە کەوای کردووە (پیاوی باوەڕداری گەلی فیرعەون ڕاستەوخۆ بۆ گەلەکەی خۆی و بۆ ئێمەی گوێگریش کەدەمانکاتە ئامادەبوونێکی ڕاستەوخۆ لەکۆڕەکەدا باسی پێغەمبەرێکی تری پێشوومان بۆ بکات ناڕاستەوخۆ) بەواتا گێڕانەوە لەناو گێڕانەوەدا، بەواتا دوای ئەوەی خودای کار جوان دووبارە



جوولەی بەپیاوە باوەڕدارەکە بەخشیەوە بۆ ئەوەی قسە لەسەر کەسایەتی و کەسانێکی نەجوولەدار بکات، ئەمەش چوونە ژوورەوەو تێکەڵ بوونی کاتە بۆ ناوکات و شوێنە بۆ ناو شوێن بەواتا کاتێکی زیندوو بۆ کاتێکی مردوو هەروەها شوێنێکی زیندوو بۆ شوێنێکی مردوو، پاشان پتر ئایندەی لەخوا یاخییان نیشان دەدات بەوەی دەڵێ: ﴿ الذين يجادلون في ايات الله بغير سلطان آتاهم كبر مقتاً عند الله وعند الذين امنوا كذلك يطبع الله على كل قلب متكبر جبار﴾[١٦].

بەڵێ ئەی هۆزەکەم کەسانێ کەدەم درێژی لەنیشانە روونەکانی خودا دەکەن بەبێ هیچ بەڵگەو نیشانەیەك کە بۆیان هاتبێ ئەمە دەبێتە مایەی توورەبوونی خوداو پاشان بڕوادارانیش، کەواش بوو ئاوها خودا مۆری گومڕایی لەدڵی هەموو کەسێکی خۆ بەگەورەزان و ستەمکار دادەنێ.. لێرەوە دووبارە فیرعەون دێتەوە قسە لەکۆشکی خۆیدا بێ ئەوەی بانگی خەڵکەکە بکات ئەوەندە نەبێ بە (هامان)ی وەزیر دەڵێ: (وقال فرعون) جا خودای گەورە بۆیە دەڵێ (فیرعەون گوتی) چونکە ئێمە کەبووینە بەشێك لەنێو هۆزەکەی فیرعەون و ئەمێستاش هۆزەکە لەنێو کۆشك نین بۆیە ئەگەر خودا پێمان نەڵێت فیرعەون چی بەهامان گوت ئەوا ئێمە لەم گفتوگۆ نهێنیە ئاگادار نەدەبووین کەفیرعەون بەهامانی گوت:

﴿ ياهامان ابن لي صرحا لعلي أبلغ الاسباب ﴾[١٧] ئەی هامان ئەی وەزیرەکەم کۆشکێکی بەرزە بۆ دروست بکە تا بگەمە ئامرازێك بمگەیەنێتە داواکەم..

﴿ اسباب السماوات فاطلع الى موسى واني لاظنه كاذبا﴾[١٨]

ئەمە لەکاتێکا کەخەڵکانێکی زۆر باوەڕیان بەموسا هێناوە لەبەر نیشانەو بەڵگە روونەکانی بۆیە فیرعەون توورە بووەو دەیەوێ بگاتە ئەنجامێ بەقازانجی خۆی بکەوێتەوە، بۆیە دەڵێتە هامانی وەزیری دەمەوێ کۆشکەکە هەند بەرزبێت ببێتە هۆکارێك بۆ بەرزبوونەوەم بۆ ئاسمانەکان و ئاگاداربوونم لەخوداکەی موسا چونکە پێم وایە و واهەست دەکەم درۆ بکات.. ﴿ وكذلك زين لفرعون سوء عمله وصد عن السبيل وماكيدفرعون الا في تباب ﴾[١٩] تا بەم جۆرە کردەوە خراپەکانی فیرعەون لەبەرچاوی رازابووەوەو هەر ئەم کردەوە خراپانەش بوون لەرێگای راستیان لادا، بەم جۆرە هیچ فێڵ و پیلانێکی فیرعەون و فیرعەونیەکان سوودی نابێ و مەگەر هەر زیان بەخش دەبێت، پاشان دووبارە پیاوە باوەڕدارە کە دەچێتەوە نێو خەڵکەکەو لەدەرەوەی کۆشکەکە پێیان دەڵێت: (وقال الذى امن) جا خوای گەورە بۆیە دەڵێ کەسە باوەڕدارە کەگوتی تا هەم شوێنە کەبگوازێتەوە کە کۆشك بوو بۆ دەرەوەی کۆشك و هەمیش حیوارە کە بگوازێتەوە کە لەنێوان فیرعەون و هامان بوو بۆ پیاوە باوەڕدارەکەو گەلەکەی، ئەم جۆرە پێناسەداریەش خودای کاربەجێ بۆ ئێمەی (گوێگر)ی روون کردۆتەوە، پیاوە باوەڕدارەکە بەگەلەکەی دەڵێت کە ئێمەش وەك بینەرو گوێگرێکی نزیك لەوێین دەڵێت:﴿ ياقوم اتبعون أهدكم سبيل الرشاد ﴾[٢٠] ئەی هۆزەکەم بەدوای من بکەون (کەمنیش بەدوای موسا کەوتووم) رێگای راستتان نیشان دەدەم، کەئەمەش هێمایە بۆ چەوتی رێگاکەی فیرعەون و بێ باك پێیان دەڵێت رێگای خودا ( ا لله) رێگایەکی سەرفرازو رێگای فیرعەونیش چەوت و خوارە، وەرنە لای من نەجاتتان دەدەم لەگومڕایی: ﴿ ياقوم انما هذه الحياة الدنيا متاع وان الاخرة هي دار القرار﴾[٢١] وەرن ئەی گەلەکەم ئەو ژیانەی کە دونیایە ژیانێکی براوەو کەم خایەنەو شوێنی پشت پێ بەستان نییە بە لام ژیانی دوایی و ژیانی زیندووبوونەوە ژیانێکی نەبڕاوەو هەروەها شوێنگەی حەسانەوەو دڵنیابوونی هەتاییە.. ئەمەش گێڕانەوەیەکی بێ پەردەوا راستەوخۆیە لەنێوان پیاوە باوەڕدارەکەو گەلەکەی و ئێمەش لەگەڵیان: ﴿ من عمل سيئة فلا يجزى الا مثلها ومن عمل صالحا من ذكر أو انثى وهو مؤمن فاولئك يدخلون الجنة يرزقون بغير حساب ﴾[٢٢] بەواتا هەر کەسێکتان خراپەیەك بکات بە ئەندازەی خراپەکەی خۆی سزا دەدرێ لەدواییدا، وەهەریەکێکیش کردەوەی چاك ئەنجام بدات لەنێرومێ ئەوا پێی دەبێتە باوەڕدارو کە بووە باوەڕداریش ئەوا ئەوانەی باوەڕیان هێناوە دەبردرێنە بەهەشت و لەوێشدا رزق و رۆزییان پێ دەدرێ بێ شومارو بڕانەوە ... کەئەمەش هێمایە بۆ درکاندنی (بەهەشت و جەهەننەم) بەخەڵکەکەو بەدرۆخستنەوەی بەهەشتەکەی فیرعەون، ئەمەش گێڕانەوەیەکی راستەوخۆ یەکسان کردنی شوێن و کات و کاراکتەرەکانە لەحیوارەکەدا، کە پیاوەکە قسەکەرو گەلەکەش گوێگر دەبن بەواتا گوێگرتنی



ئێمە گوێگرتنێکە لەناو کۆمەڵێکی گوێ گرتوودا.. ئیدی دواتر هەندێ گفتوگۆی نهێنی دیارە لەنێوان پیاوە باوەڕدارەکەو گەلەکەی، هەروەها لەنێوان فیرعەون و گەلەکەیرووی‌داوەو گەلەکەی پتر مەیلیان بەلای فیرعەون کەوتۆتەوە جا یان لەترسان یان لەبرسان بۆیە بەپیاوە باوەڕدارەکەشیان گوتووە تۆش پەشیمان بەوە لەباوەڕەکەت و تۆش وەرە ببە گوێڕایەڵی فیرعەون بۆیە پیاوە باوەڕدارەکەش بەنیمچە تووڕە بوون و گازاندەیەکەوە بێ پەردەو لەژێر قسەکردنێکی راستەوخۆدا بێ ئەوەی گێڕانەوەی پێوە دیار بێ دەڵێت:﴿ و يا قوم مالي أدعوكم الى النجاة وتدعونني الى النار ﴾[٢٣]، ئەری ئەی هۆزەکەم ئەوە چیە من هەر پێتان دەڵێم خودای تاک و تەنها (الله) بپەرستن و باوەڕبێنن بەموساو بەڕۆژی دوایی و کردەوەی چاک بکەن و دەمەوێ رزگارتان بکەم کەچی ئێوەش بانگم دەکەن بۆ رەفتاری خراپ و بێ فەرمانیی خوداو بۆ ئاگری جەهەننەم..

﴿ تدعونني لأكفر بالله وأشرك به ماليس لي به علم وأنا ادعوكم الى العزيز الغفار ﴾[٢٤]، ئێوە بانگم دەکەن تا من کوفرانە بەخوداو دینی خوداو هەقیانەتی خودا بکەم و هاوەڵ بۆ خۆی و بۆ دروست کردنی مەخلووقەکانی دابنێم و شتی تریش هاوشانی ئەو بەگەورەو خودا بزانم وەکو شەیتان و نەفس و فیرعەون و ئەوانە (اعوذ بالله) کەچی ئەمنیش بانگتان لێ دەکەم بۆ لای خودایەک کەبەهێزو دەسەڵاتە بۆ لەناوبردنی تەخت و تاراجی ستەمکارانی وەکو فیرعەون و هامان و قارون و هەروەها لێبوردەشە لەسەر خراپەکانتان ئەگەر پەشیمان ببنەوەو روو لەخودا بکەن، ﴿ لاجرم إنّما تدعونني اليه اليس له دعوة في الدنيا ولا في الآخرة وأنّ مردنا الى الله وأنّ المسرفين هم اصحاب النار ﴾[٢٥]، بەڵێ ئەی هۆزەکەم ئەوەی ئێوە منی بۆ لای بانگ دەکەن هیچ توانایەکی نیە لەسەر ئەوەی میواندارییەکی تەواومان بکات و خۆشیمان پێ ببەخشێ نە لەدونیاو نەلەقیامەتیش، خۆ بێ گومانیش گەڕانەوەی کۆتایی هەموو کەسێکیشمان هەر بۆ لای خودایە، جا ئەگەر کەسانێک گوێڕایەڵی خودا نەبوون و زیادەڕۆییان بەدرۆ لەسەر خودای پاک و بەتوانا کردبێ ئەوا دەبنە خەڵکانی نێو دۆزەخ و تیای دەمێننەوە.. ﴿ فستذكرون ما أقول لكم وأفوض أمري الى الله ان الله بصير بالعباد ﴾[٢٦]، بەلام باش بزانن دوای ئەوەی کەسزاتان بۆ دێت لەلایەن خوداوەو رادەگیرێن لەڕۆژی قیامەت و رۆژی لێ پرسینەوە ئەوا قسەکانی منتان دێتەوە یاد کەهیچ سوودێک نابێ ئەو دەمە، بەلام بزانن من کارو ئایندەو ژیانی خۆم بەخودا دەسپێرم و خوداش بینەرە بەرامبەر بەندەکانی (ئەمە تێرە کاراکتەرەکان خۆیان قسەیان دەکردو چیرۆکەکەیان درێژ دەکردەوەو خۆیان بەرەو ئەنجامیان دەبرد بەفەرمانی خودا) کەوتبوونە جووڵەو شوێنەکان بوونیان هەست پێ کراوو کاتەکانیش دیارو بەرچاو بوون کەلەهەرە زۆرینەی حیوارەکان ناکات و شوێنەکان هاوشان و جووت دەکران لەگەڵ کات و شوێنی گوێگری دووەمی حیوارەکان (ئێمە)ی دەرەوەی رووداوە قورئانیەکە) بەلام دواتر چیرۆکەکە دەکوژێتەوەو تەواو دەبێ خودای کار بەجێ جووڵە لەشتەکان دەسێنێتەوەو رووحیشیان بەستوو دەکاتەوەو راستەوخۆیی دەگوازێتەوە بۆ ئێمەو ناڕاستەوخۆیی ئێمەش دەبەشێتە کاراکتەرەکانی ئەوان و بێ پەردە بەئێمە دەڵێ:﴿ فوقاه الله سيئات ماكروا وحاق بئال فرعون سوء العذاب ﴾[٢٧]، بەواتا خودای گەورە خۆی کۆتایی بەچیرۆکەکە دێنێ و لەدوا پەردەیا دەفەرموێ خودا ئەوی (واتە پیاوە باوەڕدارەکە)ی پاراست لەپیلانەکانی ئەوان (واتە فیرعەون و فیرعەونیەکان)و هەروەها سزاو تۆڵەی توندی خودا ئەوانی داگرت و عەزابی بۆ ناردن.. کەئەمەش هێمای گێڕانەوەی کاتی ئەو دەمی ئەوێ (میسر)ەو بەخۆهاتنەوەی کاتی ئێرەش.. هەروەها بەشوێن کردنەوەی ئەوێ و تێرامان شکاندنی ئێمەش کەگوێگرین لەرووداوەکە، هەروەها جووڵە بەستن کردنەوەی کاراکتەرەکانی ئەومیش و کەوتنەوە گەڕی جوولەی ئێمەش.

والسلام عليكم ورحمة الله

وصلى الله عل محمد وعلى آله وأصحابه أجمعين.

**تێبینی: ژمارەکانی (١، ٢، ٣هەتا ٢٧).**

**بریتیە لەئایەتەکانی** (٢٣- ٢٤-٢٥- ٢٦- ٢٧-٢٨- ٢٩- ٣٠- ٣١- ٣٢- ٣٣- ٣٤- ٣٥- ٣٦- ٣٧- ٣٨- ٣٩- ٤٠- ٤١- ٤٢- ٤٣- ٤٤- ٤٥) **لەسورەتی غافر.**



# چارەسەرکردنی سایکۆلۆژی لەقورئانی پیرۆزدا

بەهادین جەلال

**پێشەکی:**

ئەو پێشکەوتنە شارستانی و تەکنەلۆژیایەی کە ئێستا وڵاتانی دونیا بەخۆیانەوە دەبینن، دەردەسەری و کێشەی ئاڵۆزو ناڕەحەتی بۆ مرۆڤ لەهەندێك بواردا هێناوەتەکایەوە، مرۆڤی ئەو سەردەمە، وێڕای داهێنان و خزمەت کردنی مرۆڤایەتی لەسەرجەم بوارەکانی زانست و ئابووری و ژیاری‌دا، بەڵام لەم سەدەیەدا، دووچاری دەیان نەخۆشی دەروونی و عەقڵی بووە، کەماوەیەکی زۆری گەرەکە بۆ چاك بوونەوەو خۆ رزگار کردن لەرارایی و نیگەرانی و پەشۆکاوی و خەمۆکی، لەم باسەدا، رۆڵی قورئانی پیرۆز لەچارەسەرکردنی هەندێ لەو نەخۆشییە سایکۆلۆژیانە دەخەینە روو.

## کاریگەریی رۆحیانەی قورئانی پیرۆز

قورئانی پیرۆز، هێزێکی رۆحی هەیە کە راستەوخۆ کار لەدەروونی مرۆڤایەتی دەکات، سەیرنیبە کەقسەکانی خوا لەماوەیەکی کورتدا رەفتارو هەڵسوکەوتی خەڵکی گۆڕی و بۆ ئەم راستییەش خوا لەقورئاندا دەفەرموێ: ﴿ وتنزل من القران ماهو شفاء ورحمة للمؤمنين ﴾ ئایەتی الاسراء /٨٢ هەروەها لەشوێنێکی دیکەدا روو لەموسوڵمانان دەکات و دەفەرموێ:

﴿ يأيها الناس قد جاءتكم موعظة من ربكم وشفاء لما في الصدور وهدى و رحمة للمؤمنين ﴾ ئایەتی یونس/٥٧

لەم ئایەتانەی سەرەوەدا کاریگەریی قورئان لەدەروونی خەڵکدا دەردەکەوێ، کەبۆ ئەو کەسانەی برواییان هێناوە، رێنماییان دەکات بۆ رێگای راست، بەم شێوەیە دەروون لەرق و کینە پاك دەکاتەوە، بەم جۆرە لەشی مرۆڤ چاك دەبێت چونکە دەروونەکەی خاوێن بۆتەوە، لێرەدا چارەسەرو شیفای قورئان لەدەروونی مرۆڤ بەباوەڕ پەنگ دەخواتەوە.

سالآنێکی لەمێژە هەوڵێکی زۆر لەئارادایە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییە سایکۆلۆژییەکان، چەندین شێوازی هەمەجۆر پەیرەو کراوە، بەڵام نەتوانراوە بەیەکجاری کۆنترۆڵی ئەو نەخۆشییانە بکرێت و چارەسەری بنبڕیان بۆ بدۆزرێتەوە. لێکۆڵینەوەکان سەلماندوویانە کەتێکرای چاك بوونەوە لەنێو نەخۆشە دەروونیەکان کەبەرێگای (شی کردنەوەی دەروونی) چارەسەرکراون لەنێوان ٦٠ تا ٦٤٪ ئەنجامەکەی دەرکەوتووە کە ئەم رێژەیە زۆر کەمە لەچاو ئەو نەخۆشانەی کەبەبێ هەوڵی پسپۆڕانی دەروونیەوە چاك دەبنەوە کەلەنێوان ٤٤٪ و ٦٦٪دایە.

دکتۆر (ئەلکسیس کاریل) کەخەڵاتی نۆبڵی وەرگرتووە دەڵێت: (لەکۆمەڵایەنی خۆرئاوا، کەنەخۆشی دەروونی و عەقڵی تەشەنەی کردووە. هەر چەندە لەهەوڵ و تەقەللای زانستی و شی‌کردنەوەی دەروونی‌دا درێغیمان نەکردووە، بەڵام ناتوانین بەرێژەیەکی سەرکەوتوو. نەخۆشەکان چاك بکەینەوە.

## بڕوایی و پەرستن.. کەسایەتی پتەو

زۆربەی زانایانی سایکۆلۆژی لەسەر ئەو رایە کۆکن، کەمەسەلەی بڕوابوون بەخوای پەروەردگارو بیرکرانەوە لەدروست کراوەکانی ئەو یەزدانە مەزنە، کاریگەرییەکی راستەوخۆی بۆ چاك بوونەوەی



نەخۆش هەیە، زانای ئەمریکی (هینری لینك) دەڵێ: (لەئەنجامی پشکنین و چارەسەر کردنی سەدان نەخۆش بۆم دەرکەوت ئەوانەی هاتۆچۆی پەرستگاکان دەکەن بەتایبەتیش- موسڵمانان- کەلەهەندێ وڵاتانی موسڵمان رووماں تێ دەکەن، کەسایەتییەکی پتەوو قایمیان هەیەو زووتر چاك دەبنەوە بە بەراوردکردن لەگەڵ ئەو کەسانەی کە (بڕوایی و پەرستن لەدڵیاندا بەدی ناکرێ) هەروەها زانایەکی دیکەی بەریتانی دەڵێ (پیاوی ئیماندار هەرگیز تووشی نەخۆشی دەروونی نابێت) بۆیە لەنەخۆشخانەیەکی نیویۆرك، دەیان نەخۆشی دەروونی و کەم ژیریی خرانە ژووری چارەسەرکردنەوە، دوای ئەنجام دانی نەشتەرگەری و هێندەی کارەبایی لەمێشك و دەمارەکان و پێ دانی دەرمانی سڕکەرو هێمنکەرەوە، دەرکەوت کە ئەوانەی بڕوایی تەواویان بەخوای پەروەردگارو ئایینەوە هەیە، زووتر چاك دەبنەوەو پێویستیان بە ماوەیەکی کەم هەیەو خێرا نەخۆشخانە جێ دێڵن.

لەئایینی پیرۆزی ئیسلامیشدا، دەبینین،بڕوابوون بەخوای مەزن، کە موسڵمان لەمنداڵییەوە، دەروونی پێ رۆشن دەکاتەوە، جۆرە بەرگریی و بەرهەڵستیەکی لەتووش بوون بەنەخۆشییە سایکۆلۆژییەکان پێ دەبەخشێ.

خوای گەورە دەفەرمووێ:﴿ **الذين أمنوا وتطمئن قلوبهم بذكر الله الا بذكر الله تطمئن القلوب** ﴾ ئایەتی الرعد/٢٨.

## یادکردنی خودا

یەکێك لەهۆیەکانی چارەسەرکردنی سایکۆلۆژی لەقورئانی پیرۆزدا، یادکردنەوەی خودایەو وردبوونەوەیە لە گەورەیی و توانا لەبن نەهاتووەکانی، بۆیە لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە ﴿ **یا أیها الذین امنوا اذکروا الله ذکراً کثیراً وسبحوه بکرة وأصیلاً** ﴾ ئایەتی الاحزاب ٤١.٤٢..

بۆیە خوای گەورە بەراشکاوی بەموسڵمانان رادەگەیەنێ کە دوورکەوتنەوە لەیادو وێردی خوای پەروەردگار، مرۆڤ تووشی دڵتەنگی و نائومێدی دەبێت لەژیاندا ﴿ **ومن أعرض عن ذكري فان له معيشة ضنكاً ونحشره يوم القيامة أعمى** ﴾ ئایەتی طه/١٢٤.

هەر لەبەر ئەوەیە کە یادکردنەوەو ناوهێنانی خوا بەبەردەوامی دڵی مرۆڤی ئیماندار نەرم دەکات و سەر بۆ گشت قەدەرەکان دادەنوێنێ، هیچ رەفتارو هەڵسوکەوتێکی هەڵەو چەوت ناکات و دڵنەوایی دایدەگرێ و بەم شێوەیەش لەگشت نەخۆشییەکانی دەروونی دوور دەکەوێتەوە.

زۆربەی ئەوانەی تووشی نەخۆشییە دەروونییەکان دەبن هەست بە نیگەرانی دەکەن کاتێك گوناهێك ئەنجام دەدەن و پاش ماوەیەك هەستی پێدەکەن بەڵام ئیماندار کاتێك تۆبە دەکات و لەخوا دەپاڕێتەوە کەڵێی ببوورێت، تەزوویەکی خۆش و نەشئەیەکی دڵشاد دڵی رۆشن دەکاتەوە، ﴿ **ومن يعمل سوءاً أو يظلم نفسه ثم يستغفر الله يجد الله غفوراً رحيماً** ﴾ **سورة النساء**/١١٠.

لەکۆتاییدا ئاماژە بەوە دەکەین کە زۆربەی وڵاتانی ئەورووپا وێرای ئەو گوزەرانە چاکەی هاووڵاتیان هەیانەو حکومەت ژیانی خەڵکەکەی مسۆگەر کردووەو هەژارو سواڵکەریان تێدانییە، بەتایبەتیش (سوید) کە ٤٠٪ی بودجەی ئەو وڵاتە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییە دەروونییەکان ساڵانە خەرج دەکرێت، بۆیە زانای بەناوبانگی ئەمەریکی (کۆلن ولسۆن) دەڵێت:( لەئەورووپاو ئەمەریکا، ژیانێکی شارستانی و پێشکەوتووی تەکنەلۆژیا بەرقەرارە، بەڵام هەرگیز خەڵکەکەی دڵی بەو ژیانە خۆش نییە، بەپێچەوانەی وڵاتە ئیسلامەکانی دونیا کە ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئارامی و خۆراگری پێ بەخشیون و لەبەرامبەر گشت کارەسات و مەینەتی و ستەمێك بەورە بەرزییەوە وەستاون، چونکە باوەڕیان بەرووداوو قەدەرەکانی خوا هەیەو بۆتە پرۆگرامی رۆژانەی ژیانیان).

**سەرچاوە :**


١- **العلاج النفسی فی القرآن الکریم/ ابراهیم النعمة.**

٢- **الاسلام والعلم الحدیث/ عبدالرزاق نوفل.**

٣- **دع القلق وابدأ الحیاة دیکل کارنجی.**



# خۆشەویستی خواو پێغەمبەر لەروانگەی دەروونزانییەوە

ئامادەکردنی : فاروق نەسرەدین

خۆشەویستی حاڵەتێکە لەحاڵەتەکانی هەڵچوونی دەروونی بەبێ هۆکاری راستەقینە دروست نابێت، نیشانەی خۆشەویستی راستە قینە بەردەوام بونیەتی وەکو خۆشەویستی مرۆڤ بەرامبەر بەخوای میهرەبان، چونکە ئەگەر کەسێك خواو پێغەمبەری خۆی خۆشویست چتیر ناگەڕێتەوە دواوەو تا بچێتە تەمەنەوە زیاتر خۆشی دەوێ و ئیمانی پێی بەهێزتر دەبێت، چونکە لوتکەی خۆشەویستی راستو رۆحانی خۆشەویستی مرۆڤە بۆ خوای میهرەبانو پەرۆشی ئەو مرۆڤە بۆ نزیکبوونەوە لەخوای گەورە، هەڵبەت خۆشەویستی تەنها لەنوێژو رۆژوو دەرناکەوێت، بەڵکو لەهەر رەفتارێکدا هەیە کە لەو مرۆڤەوە دەردەچێت بەتایبەتی هەرکارێكو هەر رەفتارێك کەدەیکات لەخوای گەورە داوا بکات کە لێی پەسەند بکات..

﴿ قل إن كنتم تحبون الله فاتبعوني يحببكم الله ويغفر لكم ذنوبكم والله غفور رحيم ﴾...ال عمران ٣١.

خۆشەویستی مرۆڤی بەئیمان بۆ خوای گەورە لەسەرو هەموو خۆشەویستیەکەوەیە لەژیاندا، هاوکات زیاترە لەخۆشەویستی مرۆڤ بۆ منداڵەکانیو خێزانو دایكو باوكو تا سەروەتو سامانیش ﴿ ومن الناس من يتخذ من دون الله اندادا يحبونهم كحب الله والذين أمنوا أشد حباً لله ﴾ البقرە-١٦٥.

لەکاتێکدا مرۆڤ هەموو خۆشەویستیەکی بۆ خوا تەرخانکردووە ئەو خۆشەویستیە دەبێتە هێزێکی پاڵنەری ژیانو بیرکردنەوە لە بوونو سەرچاوەی ئەو بوونە، کە خوای مەزنە، هەموو جۆرە خۆشەویستیەکانی تریش ملکەچی ئەم خۆشەویستیە دەبن، کەبۆ خوای گەورەیە، بەو شێوەیە دەبێتە مرۆڤێك کە پاڵنەری خۆشەویستی تیایدا بۆ هەموو شتێك لەجووڵەدایە، خۆشەویستی دراوسێ خەڵك، ئاژەڵ، هەموو دروستکراوەکانی تری خەڵقەندەی خوای گەورەو گەونیش، هەروەها هەست دەکات هەموو شتەکانی دەوروبەری بوونو گەورەیی خوای تیادەر دەکەوێت وای لێ دێت زیاترو زیاتر پەرۆشی خوا بێت لەدڵو دەرونەوە، بێ شك پاش خۆشەویستی خوای گەورە، خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ دێت کەخوای گەورە وەك رەحمەتێك ناردی بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی کەرێگای راستیان پێ پیشان بداتو فێری خوێندنو نووسینیان بکاتو لەتاریکیو جەهل و جوهالەتو بت پەرستی رزگاریان بکات، ئەو پێغەمبەرەی کە خوای میهرەبان هەڵیبژارد کەدوا پێغەمبەر بێت بۆ سەرجەم خەڵك، بەڵگەشمان بۆ مەزنی پێغەمبەر ﷺ دابەزینی قورئانی پیرۆزە، چونکە نموونەی تەواوی مرۆڤە بێ کەموو کووڕی لەرەوشتو ئاکاردا، کەخاوەن چاکەو سیفاتی تایبەتەو باشترین بەڵگەش بۆ گەورەیی پێغەمبەر لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە...

﴿ وأنك لعلى خلق عظيم ﴾ القلم ٤.

قورئانی پیرۆز خۆشەویستی پێغەمبەری ﷺ گرێداوە بەخۆشەویستی خواوە وەك لەئایەتی (٢٤) لەسورەتی (التوبە)دا هاتووە...

﴿ قل ان كان أباءكم وابناءكم واخوانكم وازواجكم وعشيرتكم واموال اقترفتموها وتجارة تخشون كسادها ومساكن ترضونها أحب اليكم من الله ورسوله ، وجهاد في سبيله فتربصوا حتى ياتى الله بأمره والله لايهدى القوم الفسقين ﴾.

---

سەرچاوە:

القرأن وعلم النفس- د. محمد عوسمان نجاتی- دار الشروق ١٤٠٥هـ - ١٩٨٥م.



# ئایینی ئیسلام و هێڵە هەمەلایەن و گشتییەکانی ئابووری

ئامادەکردنی بەدەستکاریەوە: محەمەد فەخرەدین جەباری

ئاشکرایە ئایینی ئیسلام ئایینی بەخشراوی خواوەندە بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی ئایینی هەوێنی گۆرینی واقعێکە بۆ واقعێکی پۆزەتیڤی ویستراوو خواستراوی رێچکەی سروشت ئایینی بەرژەنگو شەقڵی داکۆکی مافەکانی مرۆڤایەتی‌یە لەچوار چێوەو قاوغێکی ژیاری پێشەڤەچوی واقیع بینانە ئەمەش نهێنی (سر) پەخش بوونێتی لەهەموو سووچ و کەلەبەرەکانی چوار چێوەی گێتی ئاینی ئیسلام وەکو ئایینەکانی تر، تەنها ئایینێکی روحی نییە کە پەیوەستی نێوان مرۆڤ و خوای گەورە لە بوارێکی زۆر بەرتەسکی ژیاندا سیستەمو پێك کردبێ. بەڵکو ئایینێکە هە مەلایەن و سەراپاگیرەو سەرجەم بوارەو رێچکەکانی ژیان، رامیاری، سیوسۆلۆژی (الاجتماعیة)، کەلتووری فەرهەنگی، ئابووری هتد گرتۆتەوە.

هەر لەبەر ئەوەشە ئیسلام پرۆگرامێکی ژیاری پێشکەوتووە بۆ تێکرای ژیانی مرۆڤ و بەرخودانی تاقیکردنەوە ئەزموونێکی دیرۆکی بەئاگاو زیندووە کەلەتوانایدا بووە لەسەردەمی خۆیدا ناستەنگ و چەڵەمەکانی سیاسی و کۆمەلا یەتی و ئابووری‌کانی کۆمەڵگای ئیسلامی بەشێوازێکی دادپەروەروگەرانە. دەست نیشان و چارەسەربکات. بواری ئابووریش وەکو سەرجەم بوارەکانی گرنگ و رادیکاڵی ژیان. بایەخێکی زۆری پێ بەخشراوەو رێ رەوو سیستەمی گشتی وای بۆ بنیاد نراوە کە لەهەموو شوێنی و کاتێکدا توانای فەراهەمو پراکتیزەکردنی هەیە، بەبارو هەل و مەرجی تایبەتمەندی خودی خۆیەوە.

لەم سونگەیەشەوە خۆشنوودی‌یە بۆ ئێمە ئەگەر هێڵی بنەرەتی و زەقەکانی رێ رەوی ئابووری ئیسلام بەکورتی بیدرکێنین بۆ نێوەی ئازیزی خوێنەران. بێ گومان ئەوانەی رێ رەی چوار چێوەی ئابووری ئیسلام دەست نیشان دەکەن (٣) رێچکەو هێڵی سەرەکی‌یە. کەجیاوازی و پۆلێنی دەکەنەوە لە رێبازو رێرەوە دنێ وێ کانی ئەم چەرخە، نەك هەر تێکرایان نەیان توانیوە لەجیهانی ئەزموونیدا دەستەبەری سەرکەوتن بکەن و پەرێزگرتەنی نووشستی بوون، یان سەنتەرو بنکەی خۆیان لول و پێچاوەتەوە لە کۆمەڵگاکان مەنفی بوون، بەڵکو بوونەتە دێوزمەو سوار چاکی سەری میللەتان و گەلان بە چەرمەسەری‌یەوە لەرەوتی ستراتیژی رامیاری‌یە ماتریالیستەکانیان دەناڵێنن ئەم خاڵانەی لەخوارەوە باسی دەکەین ئەو سێ هێڵە پێك دەهێنێ:_

أ) چەند جۆر خاوەندارێتی ) (انواع ملكیة)

ئاشکرایە سیستەمە جیهانی مرۆڤ کردەکانی ئەم گرێ و چەرخە بەهۆی ئەوەی مرۆڤ دروستی کردوون و. مرۆڤیش لەهەموو کەمو کوری و بریارو هەڵویستەکاندا دوورە پەرێز نییە لەواقیعی هەڵەکاری و لەپێکانی ئارمانجەکان ئەمەش حاڵەتێکی خۆرسك و سرۆشتاوی فسیۆلۆژی و پێکهاتە (ترکیبة)ی مرۆڤە وەلەتوانای‌دا نییە بەتۆکمەی لە ویست و هەست و نەستی واتە (الارادة والشعور ولاشعور) مرۆڤەکان بەگشتی تێ بگات سیستەمێکی وایان بۆ پێکەوە بنێ کە بەسانایی فەراهەم بکرێت و مرۆڤیش لەژێر چەتریدا بەخۆشنوودی و ئاسوودەی ژیان بگوزەرێنن ئەمیش لەبەر ئەوەیە چونکە لەلایەك :-

١) رێ رەوی ئابووریان لەسەر بەرخودان دارێتی تە سك و تایبەتی تاکە مرۆڤ دامەزراندووە، بەرخودان دارێتی ولاتیان یاخود گشتی فرێ داوەتە گۆرەپانە پشت گوێ خراوەکان.

ب) لەلایەکی تریش ئەمجارە ری رەو رێچکەی لەسەر خاوەن دارێتی هەموو گیری نەخشە بۆ کێشاوەوە، ئەوەش بەپێچەوانەی خاڵی ئاماژە پێدراوی سەرەوە چونکە لێرەدا بەرخودان دارێتی تایبەتی وەك دژەکارێك

بێ ئەهمیەت و پشت گوێ خراوە.

لەم حاڵەتەشدا وای لێ هاو هیچ کامیان لەهەمبەر بەئەزموونی ژیانی سەرجەم مرۆڤایەتی نەتوانن خۆیان سەقام گیر بکەن و کەوتنە بەرەی بەیت و بالۆرە هۆنینەوە بۆ سیستەمەکانی حوکم دارێتی یان، بەڵام ئەمەش بەها نای پاشکۆی دڕاویان نەهات و دادی نەدان. هەتا لەلایەکیان لەرۆژ هەڵاتی نسکۆی بەرجەستەکردو لەگۆرەپانی ئابووری بەدوور کەوت، دەبێ گومان لەو لاشەوە ناجۆرو چەرمەسەری باری ژیانیان لەدەرەنجامی ئەو ڕێ ڕەوە ئابووری یەو دژوارەو کۆمەڵێك فاکتەرەی دیکەوە، ئەوەندەی ئەماوە ئەویش ببێتە هاورێگای رابوردووو بیگرێتەبەر. بەڵام ئیسلام زۆر بەپێچەوانەی ئەوانەوە وەکو سیستەم و ڕێبازێکی ئاسمانی خوای کەیەزدانی بەپیرۆز کار نەحکمەت و فرمان بەجێ ، ڕێرەوی خۆی لەسەر جۆرەها بەرخودان دارێتی بیناکردووە کە ئەمانەی لای خوارەوەن (بەرخودان دارێتی تایبەتی، بەرخودان دارێتی گشتی و بەرخودان دارێتی دەوڵەتی) بەم شێوەیە هەموو لایەنی پۆزەتیڤ و ئیجابی ئەم سێ بەشە بەرخودان دارێتی هەیە تێکرای پێوەندو گرێ دراون پێکەوەو لایەنە سەلبی و نەگەتیڤەکانیان وەلاوە ناوە لەبەر ئەوە هەر بەش و جۆرەیان بەربەست دەبێت لەبەر ڕەوتی ئەوی تریاندا کەزیا نهێنەر بێت و. ئەو کێشە کێشمەی کە لەنێوان بەرخودان دارێتی گشتی تایبەتیدا هەیە لەسیستەمی بورژوازی و سەرمایەداریدا پاك تاوی دەکاو هەمیسان ئەو مل ملانێیەی کەهەیە لەنێوان بەرخودان دارێتی تایبەتیدا لەسیستەمی سەرمایەدایداو بەرخودان دارێتی گشتیدا لەسیستەمی سۆسالیزمدا ڕەشی دەکاتەوە لەبەر ئەوە تیۆری (النظرية) جێگەداری خۆرسکێك دەدات بەمافی خاوەن دارێتی کە تخوب و سنووردارەو ئەو دوو جۆرە بەرخودان دارێتی‌یە ئەو سنوورە پێکەویان گرێ دەدات ئەمە بەکورتی لەسەر بەشی یەکەم بوو کەهێلێکی بنەرەتی ئابووری ئیسلامەو دەرکەوت کەئایینی ئیسلام بەمیکانیزمێکی داد وەرانە جیا لەرژێمی سەرمایەداری و سۆشیالیست بەهاوسەنگی بەڕێوەی دەبات

**ب) ئازادی سنوودار (الحرية المحددة)**

روون و بەرچاوە سیستەمە جیهانیکانی ئەم چەرخە یاخود ئازادی بێ سنووریان بەخشیووە بەمرۆڤ لەمەجال و بواری ئابووری‌یدا وەکو سیستەمی سەرمایەداری، کەئەویش بۆتە فاکتەرێ بۆ خوڵقاندندنی بەرەبەرەکانی و جیاوازیەکی مەزنی تۆیژایەتی و چینایەتی و ڕێژەیەکی کەم لەهاونیشتمانان هەلیان بۆ دەرەخسێت و لەسەر حسابی زۆربەی هاووڵاتی دەوڵەمەند دەبن و لەوپەڕی خۆشنوودی ژیان رادە بوێرن. وەیاخود مەسەلەکە پێچەوانە دەبێتەوە وەکو سیستەمە پێشووەکەی رۆژهەڵات ئازادیێکان قۆرغ دەکات و بەهیچ شێوازو شێوەیەك هاندەرو غەریزەیەك و پاڵنەرێك بۆ مرۆڤ لەبەرچاوناگرێ کەزیاترو پتر کۆشش و خۆی ماندوو بکات و زیاتر یاخود بڵێین باشترو چاکتر بەرهەم بێنێ و ببێتە ئامرازێك بۆ بوژانەوەو پەرەسەندنی رژێمی ئابووری ئەو دوو لایەنە پێکەوە نەیانتوانی و ناشتوانن کامەرانی و ئاسوودەی بۆ مرۆڤایەتی وەچنگ بێنێ چونکەو لەبەر ئەوە هەریەك لەو دوانە ئەمسەر یاخود ئەوسەری هێڵەکەیان گرتووە ئەوەی کە دەکەوێتە نێوان هەردووکیان لەەزرو یادکردووە بەم شێوەیە بەهەردوو لاناتوانن سیستەمێکی ئابووری تۆکمەو پتەو دابرێژن کەلەسایەیدا مرۆڤەکانی بن چەکمەیان بەبەختەوەری تەواوە بژێن وێڕای ئەو هەموو پرۆپاگەندە پف دراوانەی کەبەزەبەلاح ترین شێوە نمایش و ئارایشی ئەکەن: بەڵام ئایینی پیرۆزی ئیسلام سەرەتا وەکو سیستەمێکی خواوەندو بێ خەوش و کەمی دواتر وەك کەتەلۆکێکی دادگەرانەی پرۆسەی ژیان بەراشکاوی دانی ناوە بەئابووری ئازادا، بەڵام نەك ئازادیەکی رەهاو یاخود زەوت کراو بەڵکو ئازادیەکی رەهاو یاخود زەوت کراو بەڵکو ئازادیەکی سنووداری بەخشیوەو کۆمەڵێ بەربەست و کۆتی لەپێناوو بەرژەوەندی هاوبەش و گشتی بۆ چوار چێوە گرتووە نموونە لەم باریەوە زۆرن بەڵام دوو سێ یەك لێرەدا باس دەکەین وەکو:_

دەستەبەر کردنی دەسکەوت لەرێگای حەڵاڵ. وەدەست بڕینی خاوەن دزی، حەرام کردنی گزی و تەڵەکەبازی، حەرام کردنی سوو (ربا) ...هتد هەروەها دانانی بەرخودان دارێتی بەبەرپرسیاریەتی کۆمەڵایەتی کەئەرکەکانی سەری زۆرە. نەك خاوەن دارێتی یەکی تەواو وە خوای بەخشندەو میهرەبان دەفەرموێ ﴿ أتواهم من مال الله الذي اتاكم ﴾ النور/٣٣. لەبەر ئەوە لەئایینی ئیسلامدا تەنیا خوا خاوەنی تەواوو راستەقینەی هەموو بوونەوەرێکە بەجیهانی روحانیەت و مادیاتەوە و لێرەدا ئەرکی مرۆڤ تەنیا بەرخودان دارێتی و هەڵ سوڕاندن و سوود لێ وەرگرتن و فرمانی پراکتیزە کردن و



بەجێ گەیاندنی لەئەستۆدایە هەروەها سنووری دانـاوە بـۆ خاوەندارێتی گشتیش وەدەبێ لەسنووری نەخشەو هێڵ بۆ كێشـراوی خۆیـدا فەراهـەمو خـەرج بكرێـتو سـوودی لێ وەربگیرێت، لەبەر ئەوە سیستەمی ئابووری ئاینی ئیسلام پەیوەندییـەكی ئەسـتوورو تۆكمـەی بەرەوشـتەوە هەیـەو سـەرجەم بنـەما رەوشـتیە چاكـەكانی لەبـەر چـاو دەگـریو لەجمو جۆڵی ئابووری جیای ناكاتەوە.

ئـەو بەربەسـتو سـنوورانەی كـە بـۆ ئـابووری ئیسـلام دانراون لەدوو رێگەوە چەسپاوو سەقام گیر دەكرێن، لەلایەك لەرێگای پەروەردەی مرۆڤـەوە پاڵنـەری خـودی بـۆ دروسـت دەكرێت ئەمە لەلایەك لایەكی دیكەشەوە لەرێگەی چاودێری یاساییەوە چاودێری دەكرێت.

ج ) **دادگەری كۆمەڵایــەتی ( العدالة الاجتماعیة )**: لـەئایینی ئیسلامدا دادوەری كۆمەڵایەتی بنەمایەكی زۆر گرنگە، بۆیە لــەبواری ئابووریشــدا رۆڵــی نرخێنــدراوەو بەبنەمایــەكی رادیكاڵیو گرنگ دانراوەو تەخمین كراوە ئەمیش لـەئارمی مـەزنی ئیسـلامەوە كـە (میانـەڕەوی)یـە هـەڵقوڵاوەو ژێـدەر دەگرێت بەم پێودانگەو لەسەر ئەم بنەمایە دەتوانین بڵێین ڕێ رەوی ئـایینی ئیسـلام لـەڕێ رەو رێچكـەكانی تـر جـودای كردۆتـەوە لەوانەیەو بۆشـی هەیە لێرەو لەوێ لەم لاو لـەو لا یـەكێك بڵێت خـۆ دادگـەری ئـارمیی بریقـەداری سیسـتەمی سۆشیالیسـتیی‌یە، بـەڵێ ئێمـەش دەڵێـن ئەمـە راسـتە بـەڵام لەسەر قاڵبو بناغەیەكی رەوشتی نەگۆڕ واتە (اسلوب غیر الثابت) نییە، بەڵكو لەسـەر بنەمایـەكی مـاددیو ملمڵانـێو ناكركی چینایەتی بنیاتو دادەمەزرێنێت.

لەسیسـتەمی سەرمایەداریشـدا ئـازادی رەهـا دراوەبـەو مێزانەی كەلە هـەموو بوارێكـی سۆسیۆلۆژی (كۆمەڵایـەتی) ئابووریشـەوە بـێ دەرامـەتانو هـەژاران دەچەوسێننەوە، هـەر نەوەشە كەسەركوت كردن لەو سیستەمەدا تـەنیا بـەتوێژی كرێكـارەوە لـەو ێسـتگەییدا نەوەسـتاوە، بـەڵكو گـوزەری كـردووە بـۆ سـەركوتو خەفـەكردنی هـەموو گـەل. ئەمـەش دەسـتپێكی دەیـەها ئاسـتەنگو چەڵەمەیــە كۆمەڵایــەتی ئابووری... هتد یە

ئـالێرەداو لـەكۆتایی تونێلەكـە میانـەڕەویو بنـەما سـاز كردنـی دادوەری كۆمەڵایـەتی لەئیسـلامدا لەسـەر بنكەیـەكی بـاوەڕیو رەوشـتی گرنگـیو بـەهایی بـەزەقی قـووچو كێـل دەبێتـەوەو بـەدیار دەكـەوێت، ئـەمیش لەبـەر ئـەوە چونكـە لەســەر بنــەمای فەلســەفی داد پــەروەری كۆمەڵایــەتی دانەرێژاوە.

رەنگدانـەوەی ئـەم دادگەرییـەش لـەم دوو خاڵـەدا پوخـت دەكرێتەوە:

أ ) **ئوباڵدارێتی گشتی**: ئەمیش مانای ئەوە ئەبەخشێ هەر كەسە لەپێگەو ئاستی خۆیدا وەكو فرمانو ئەركێكی ئاینی پێویسـتە لەسـەری لـەخودی خـۆیو دواتـر بنەماڵەكـەیو كەسو كاریـەوە دەسـت پـێ بكـاتو هـەما هـەنگیان بكـاتو كۆمەكو یارمەتیان پێ بكات لەهەموو كاروبارێكی پرۆسەی ژیاندا.

ب ) **( هاوســەنگی كۆمەڵایــەتی )**: بـێ گومـان ئـەمیش پێویستەو ئەركی سەرشانی لایە پەیوەنددارو داو دەزگاكانی وڵاتە كەلەرێگای بەخشینیو دەرامەتە گشتیكانو زەكاتـەوە یەكتاكێشـیو هـاو سـەنگی لـەنێوان سـەرجەم توێژەكـانی كۆمـەڵگا پێـك بـهێنێتو بـوار نەڕەخسـێنێت بـۆ خولقـاندنی بەربـەرەكانێی چینایـەتی، توێـژێ بالا دەسـتو ئەوی تـر بـێ دەسـت یـەكێ كیـان چەوسێنەرو ئەوی تـر چەوسـاوە. رێگـە نەدان توێژی بێ دەرامـەتو خـوا پێداوەكـان مـەدای نێوانیـان فراوان بێت تا كێشە كێشم لە نێوانیاندا لە دایك بێ ئا بەم پێیە لـەئاینی ئیسـلامدا مـافی بـێ سنوور یاخود ئازادی بـێ سنوور هەلو بواری پێ نادرێتو، بەڵكو بەپێودانكی ئەركو مافەكان لەسـەر سیسـتەمی رێسـای خـوای دابـەش دەكرێـت، ئـەو زنجـیرو بەربەسـتانەی كـە خراونەتـە سـەر بـەرخودان دارێتی‌یە تایبەتیو ئازادیكـان تەنـها بەمەبەسـتو لـەپێناو بەرجەسـتەكردنی هاوسـەنگی دایـە بـۆ سـەرجەم ئـەندامو توێژاڵەكانی پێكهێنەری كۆمەڵ بەگشتی بەڵی ئایینی ئیسلام لەبنـەمای ئـەم ئـەو هێـڵو رێچكـە سـەرەكییە، سیسـتەمی ئـابووری خـۆی پێكـەوە نـاوە، هـەر كـاتێك هـەلو مـەرجی تایبەتی بۆ رەخسا و گونجا لەتوانایيدا هەیە گرفتو چەڵەمە ئابووریو كۆمەڵایەتیكان وەكـو هـەتوانێ چارەسـەرو تیمـار بكـاتو كارمـەرانیو ئاسـوودەییو خۆشـنوودی بـۆ سـەرجەم مرۆڤایەتی دەستەبەرە بكات لەكۆتاییو دوماهیدا هیوادارم وێـڕای خۆشـحاڵیم كەئـەم بابەتـە سـوودی پێگـەیاندن بـێ توانبێتمـان هـەندێ لەچـەمكی ئـەم ئایینـەتان بـەگوێدا دەچرپێنین.



# مەسەلەی ئابوری و بنەماکانی بوژاندنەوە لەئاینی ئیسلامدا

ئا/و- تاهیر عوسمان

باس کردنی مەسەلەی ئابووری لەئایینی ئیسلامدا پێویستە لەو راستیەوە دەست پێبکات کەوا هیچ کام لەقورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەری پێشەوا ﷺ هیچ تیۆرێک یاسیستەمێکی ئابووری دیاریکراویان تیانییە. بەڵکو ئاماژەیان بەچەند رێساو بنەمایەکی ئابووری کردووە کەبێگومان بۆ هەموو کات و سەردەمێک و شوێنێک دەگونجێن و هیچ دەستکاری کردن و گۆڕانێک قبوڵ ناکەن. بەم پێیەو لەسەر ئەو بنەما ئابووریانە دەکرێ کۆشش بکەین و لەسەر ئاستی تیۆری و هزریدا چەند بیرۆکەو تیۆرێکی ئابوری دیاریکراو هەڵبهێنجین. یاخود لەسەر ئاستی کردەیی و پراکتیکیدا سیستەمێک یاخود چەند پەیرەوێکی ئابوری بدۆزینەوە ئەو سیستەمانە یا ئەو تیۆرە ئیجتیهادیانە هەمە جۆرن و بەپێی کات و شوێن دەگۆڕێن. هەرگیز ناکرێ ئەو بیرۆکانە بەبنەما ئابوریە ئیسلامیەکان لەقەڵەم بدرێن تەنها ئەگەر پشتیان بەدەقی قورئانی پیرۆز یا قسەو کردەوەکانی پێغەمبەری خۆشەویست بەستبێ، بەو پێیە لەکاتی توێژینەوە لە مەسەلەی ئابوری لەئیسلامدا دەکرێ ئەو توێژینەوە بە (هەوڵی زانینی) بنەما ئابووریەکانی ئیسلام دەست پێ بکات. واتە زانینی (نەگۆڕ) وخستنە رووی (گۆڕاو)ەکانی بنەما ئابووریەکان کلیلی کردنەوەی ئەم باسەن. هەر لەم بوارەدا دەکرێ ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کەوا بوژاندنەوە لە ئیسلامدا متمانە دەکاتە سەر دوو بۆ چوون کەکەمیان لایەنی کۆمەڵایەتیە واتە بۆچوونی ئیسلام بۆ مەسەلەی کۆمەڵایەتی کە خۆی لەتەوەرەی سێ خاڵدا دەبینێتەوە مرۆڤ و کۆمەڵگە، کارکردن و خەرج کردن، حەلال و حەرام، بۆچوونی دووەم لایەنی ئابوریە واتە بۆچوونی ئیسلام بۆ کێشەی ئابووری ئەم گرفتەش دووبارە خۆی لەسێ خاڵدا دەنوێنێ داهاتەکان و بەرهەم، پێداویستی و تێرکردن، دابەش کردن و هاوسەنگی. هەر لەبۆچوونی یەکەمیشدا واتە لەبۆچوونی کۆمەڵایەتی بوژاندنەوەدا، بۆچوونە کۆمەڵایەتییەکەی بوژاندنەوە لەئیسلام لەسەر بنەمای دارشتنی هەرسێ بازنەکەی کێشە کۆمەڵایەتیەکەدا دادەمەزرێ، بەواتا یەکی دیکە پشت بەبۆچوونی ئیسلام دەبەستێت بۆ ئادەمیزاد و کۆمەڵگاو گەردوون. پاشان بنەمای ئاوەدان کردنەوەی زەوی و نرخ و پایەی کارکردن لەئیسلامدا، سەرباری مەسەلەی پاداشت و سزا، لەگۆشەی ئاوەدان کردنەوەو بوژاندنەوەی زەویدا پشت بەدەقێکی روون و ئاشکرای قورئانی پیرۆز دەبەستێ کەدەفەرموێ ﴿هو أنشأكم في الارض واستعمركم فيها﴾هود/٦١ ئەوەی لێرەدا پێویستە ئاماژەی بۆ بکرێ زاراوەی ئاوەدان کردنەوەیە، هەروەک خودای باڵادەست لەو ئایەتە پیرۆزەدا بەشێوەی فەرمان بەسەر ئادەمیزادیدا سەپاندوە، هەروەها دروست کردن و بوونی ئادەمیزادی لەسەر گۆی زەوی بەئاوەدان کردنەوەی بەستۆتەوە کە زۆر لەزاراوەی بوژاندنەوە فراوانترو پر مانا ترە، چونکە ئاوەدانکردنەوەی زەوی واتە گەشەکردنی سەرجەم بوارەکانی ژیانی ئادەمیزاد کەمزۆر لەبوژاندنەوە بەمانا ئابورییەکەی گەورەترە تێبینییەکی دیکە هەیە ئاوەدانکردنەوەی زەوی بناغەیە بۆکاری بوژاندنەوەو ناکرێ لەئەرکی جێنشینی سەر زەوی جیابکرێتەوە. هەروەک چۆن خودای باڵادەست ئەو شەرەفە گەورەیەی بەئادمیزاد بەخشیوەو کردویەتیە جێنشینی خۆی لەسەر زەوی هەروەک دەفەرموێ ﴿ انی جاعل في الارض خليفة ﴾ البقرة/١٣٠ کەواتە بوژاندنەوە وەکو پرۆسەیەک ئامانجی ئاوەدان کردنەوەی زەویە، لێرەشدا لەگەڵ ئەو ئەرکە مەزنەی خودای گەورەیەک دەگرێتەوە کاتێک زەوی و ئاسمانەکانی بەهەموو پێکهاتەکانیەوە خستۆتە خزمەت ئەو جێنشینە تا سودیان لێ وەربگرێ و لەخێرو خۆشی و بەروبوومیان بخواو سوپاسی خودای میهرەبانیان لەسەر بکات ﴿ وسخرلكم مافي السموات ومافي الارض جميعا منه ﴾ الجاثية/١٣ تا ئادەمیزاد جێنشین لەرێگای ئەو تەسخیرکردن و خزمەتتانەوە بتوانێ مەبەستەکانی جێنشین بێنێتەدی و ئەرکی خودای گەورە لەئاوەدان کردنەوەی زەوی راپەرێنێ. کەواتە بەپێی ئەو دەقە پیرۆزانە بوژاندنەوە پرۆسەیە کی سەپێنراوی ئیسلامیە لەسەر تاک و دەوڵەت و کۆمەڵگادا. هەروەک دەفەرموێ ﴿ هو الذى جعل لكم الارض ذلولا فامشوا في مناكبها وكلوا من رزقه واليه النشور ﴾ الملك/١٥. یاخود کەفەرموێ ﴿ فاذا قضيت الصلاة فانتشروا في الارض وابتغوا من فضل الله ﴾ الجمعه/١٠.

لەم ئایەتە پیرۆزانەی سەرەوەدا خودای باڵادەست فەرمانمان پێ دەکات بەکونج و کەلەبەرەکانی زەویدا برۆین وەتیایدا بڵاوببینەوەو بەدوای رەحمەت و ئەو رزق و بەشە بکەوین کەخودای میهرەبان پێی بەخشیوین. واتە ئەنجام دانی سەرجەم کارەکانی بەرهەمهێنان و کارە خزمەت گوزاریەکان کەئەمانیش هەر خۆیان ئەنجام دانی بوژاندنەوەن لەپێناو ئاوەدان کردنەوەی زەویدا. بناغەی دووەم- نرخی کارکردنە- کەلەگەڵ بنەمای ئاوەدانکردنەوەی زەویدا یەک دەگرێتەوە.



ئەگەر ئیسلام ئاوەدانکردنەوەی زەوی وەکو ئامانجێك بۆ ئەو بوژاندنەوەیە دانا کەمرۆڤ لەدوای دروست بونیدا پێی هەڵدەستێ، ئەمە هەرگیز واناگەیەنێ کەوا ئادەمیزاد لەم دونیایەدا بێ هودە دروست نەبوە، یاخود هەر بۆ خواردن و خواردنەوە دروست نەکراوە، بەڵکو خودای مەزن ئادەمیزادی بۆ ئەوە دروست کردوە پەیامێك بگەیەنێ ئەویش جێنشینی کردنی خودای بەتوانایە لەسەر زەوی، بۆ ئەوەی کاربکا، بەروبوومی هەبێت، ئاوەدانکەرەوە بێت، خواپەرست بێت، سوپاس گوزاری نازو نیعمەتەکانی بێت، تا لەرۆژی دواییدا بەو کارو بەرهەمو رەنجەی بەرووسووری بچێتە خزمەت خوداکەی ﴿ یاأیها الانسان انك کادح الی ربك كدحا فملاقیه ﴾ الانشقاق/٦ هاندانی ئیسلام بۆ کارکردن و ئاوەدان کردنەوەی زەوی گەیشتۆتە رادەیەك پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەفەرمووێ (هەرموسڵمانێك دارێك بروێنێ یا کشتوکاڵێك بکا، باڵندەیەك یا گیان لەبەرێك لەبەرەکەی بخوا، بەخێر بۆ خاوەنەکەی دەنووسرێ) ئەوانە نمونەن لەسەر ئەوەی کەوا ئیسلام سورە لەسەر کارکردن و پلەی کار کردن لە ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا لەریزی (خواپەرستیە) هەروەك لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە﴿ وقل اعملوا فسیری الله عملکم ورسوله و المؤمنون﴾التوبە/١٠٥ لەبەر ئەوە مرۆڤی کارکەر پاداشتی کارە باشەکانی خۆی لەدونیاو لەرۆژی دواییدا پێ دەدرێتەوە، ئەگەر ئیسلام هیچ جیاوازییەك لەنێوان ماددیو رۆحیدا نەکات، ئەوا هەرگیز دیوار لە نێوان شتی دونیایی و شتی رۆژی دوایی دروست ناکات، کەواتە هەر چالاکیەك ماددی بێت یا دونیایی لەروانگەی ئیسلامەوە کارێکی رۆحیو دوارۆژیە لەسەر ئەو زانیاریانە دەکرێ لەچوار چێوەی (ئاوەدان کردنەوەی زەوی)و (نرخی کارکردندا) لەدەقی ئەو ئایەتە پیرۆزە بگەین کەدەفەرموێ ﴿ وماخلقت الجن والانس الا لیعبدون ﴾ الذاریات/٥٦. ئەمەش وا دەگەیەنێ باوەڕهێنان لەئیسلامدا، باوەڕێکی رووتی بێ کاکڵ نیە بەڵکو باوەڕێکە پەیوەندی بەخودا پەرستی و کاری چاکەوە هەیە ئیسلام هەوڵدان بۆ پەیدا کردنی رزق و خزمەت کردنی کۆمەڵگەو بوژاندنەوەی بەباشترین جۆرەکانی خوداپەرستی لەقەڵەم داوە. نزیکی موسڵمانانیش لەخودای گەورەو میهرەبان بەپێی ئاوەدان کردنەوەی زەوی و بوژاندنەوەیەتی بەهەموو جۆرەکانیەوە. هەر لەم بوارەدا خەلیفەی دووەمی ئیسلام عومەری کوڕی خەتتاب رضي الله عنه دەفەرموێ (بەو خودایە ئەگەر ئەعجەمیەکان بەکارکردنەوە هاتن و ئێمە بەبێ کار هاتین، ئەوان لەرۆژی دواییدا زیاتر لەمحمد نزیکن) بنەمای سێیەم بە (پاداشت و سزا) ناسراوە ئەمەش پەیوەستە بەپێویستی زانینی کارەکەو پاشی بەرهەم بەجۆرو چەندایەتیەوە. چونکە باشی راپەڕاندنی کار لەئیسلام ئەمانەتەو لێپرسراویەتیە ﴿ولتسالن عما کنتم تعلمون﴾ النحل/٩٣ یاخود کەدەفەرموێ ﴿ انالا نضیع أجر من أحسن عملا ﴾ الکهف/٣٠ یاهەروەك پێغەمبەری شیرین ﷺ دەفەرمووێ:

(خوا ئەو کەسەی خۆش دەوێ کەکار دەکات و کارەکەی بەباشی ئەنجام دەدات) جوانکاری و راپەڕاندنی کارەکان بەشێوەیەکی رێکو پێك ئەرکە لەهەموو شتێکدا کەئادەمیزاد پێی هەڵدەستێ. داخوازی ئیسلامیش بۆ جوانکاری لەسنووری (پاداشت و سزا) دایە لەچوار چێوەی ترسانە لەخودای گەورە وەئاگاداری چاودێری کردنیەتی بۆ هەموو شتێکی ژیان. کاری چاکەو قسەی باش خودای گەورە بۆ لای خۆی بەرزی دەکاتەوە ﴿ الیه یصعد الکلم الطیب والعمل الصالح یرفعه﴾ فاطر/١٠ بەڵکو تەنانەت خودای مەزن هەڕەشە لەو کەسانە دەکا کەبەپێچەوانەی ئەوەهەڵس و کەوت دەکەن و بەوە دەیان ترسێنێ کەلەسزای خودای گەورە رزگاریان نابێت کەدەفەرموێ ﴿ فمن کان یرجو لقاء ربه فلیعمل عملاً صالحاً ولایشرك بعبادة ربه احداً﴾ الکهف/١١٠. لەبەر ئەوە کارکردن کۆڵەگەیەکی سەرەکی بوژاندنەوەیە وەکو سەرەتایەك بۆ ئاوەدان کردنەوەی زەوی بۆیە ئیسلام ئەوەی روون کردۆتەوە کەوا بەپێی کارکردن و سنووری چالاکیەکانی خۆی چاکەو پاداشتی پێ دەدرێ هەروەك دەفەرموێ ﴿ من عمل عملاً صالحاً من ذکر أو انثی وهو مؤمن فلنحیینه حیاة طیبة ولنجزینهم أجرهم باحسن ماکانوا یعملون﴾ النحل/٩٧ یا هەروەك دەفەرموێ ﴿یومئذ یصدر الناس اشتاتا لیروا اعمالهم فمن یعمل مثقال ذرة خیراً یره ومن یعمل مثقال ذرة شراً یره ﴾ الزلزلة/٦-٨. ئەو ئایەتە پیرۆزانە ئاماژە بۆ مەسەلەی پاداشت و سزا دەکەن کە ئیسلام لەرێگای سەرجەم چالاکیەکانی ئادەمیزاددا رێکی خستوون، بەڵکو لەمەش زیاتر ئیسلام بەهۆی ئازادی هەڵبژاردنی ئادەمیزاد بۆ کاری چاکەو رەفتاری خراپە.

فەرمان بەئەنجامدانی کارەباشەکان دەدات کەحەڵاڵی. وەرێگە لەئەنجامدانی کارە خراپەکان دەگرێ کەحەرامن. ئەگەر کارکردن نرخێك بداتە ئادەمیزاد لەژیانیدا وەئەگەر رێگایەك بێت بۆ پێش کەوتنی گەلان و ئاوەدان کردنەوەی زەوی سەرباری ئەوانە کار کردن لایەنێکی کۆمەڵایەتی دیکەی هەیە کە پەیوەندی بەبەرژەوەندی خەڵکی بەکارەکەوە هەیە کەواتە کارکردن بەپێوەرێك تاقی دەکرێتە وەکە پێویستی کۆمەڵگەیە بۆ ئەوکارەو مەودای سوود لێ وەرگرتنیەتی. یا ئەو کارانەی کە کۆمەڵگە کەڵکیان لێ وەرناگرێ و زیان بەکۆمەڵ دەگەیەنێ هەر ئەو پێوەرەشە کاری خراپ و چاك لەیەکتری جیادەکاتەوە. ئەمانەش هەرسێ بناغە سەرەکییەکەی بۆچوونی کۆمەڵایەتی بوژاندنەوە بوون لە ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا بەپێی ئایەتە پیرۆزەکانی قورئانی گەورەو قسە شیرین و پڕ لەگەوهەرەکانی پێغەمبەری پێشەوا محمد ﷺ.

سەرچاوە رۆژنامەی الحیاه ژمارە ١٢١٠٣ بەرواری ٢١ ١ ١٩٩٩



# ئایین لەدیدی رۆشنبیرانی کوردا

ئازاد خدر

لەراستیدا هەتا ئێستا تیۆرێکی گونجاوو شایستە چەکەری نەکردوە لای رۆشنبیرانی کورد بەگشت لایەنە سیاسیی و کەسایەتیەکانیەوە کە لەکۆمەڵگاو مێژووی کۆن و نوێی کوردەواریەوە هەڵقولابێ و رۆڵی ئایین بەتەواوی هەڵنەسەنگێنراوە لەمێژووی کوردا. مەبەست لێرە دووری سیاسیی ئاینیش دەگرێتەوە واتە (سوسیۆلۆجیای ئایینی کوردی) نیە، زۆربەی لایەن و حزبەکانی کورد بۆچوونیان بۆ ئایین لەدەرەوەی واقیعی کوردیدا وەرگیراون ئەم بۆچوونە تیۆری بێت یان پراکتیکی بێت بەشێوەیەکی دۆگمایی دروست بووە، نەك لەواقیعی بابەتی ی کورد لەجیاتی بۆچوونێکی تایبەتی کوردی بۆئایین ئەم لایەن و حزبانە وەهەتا خەڵکی ئاسایی کورد پتر بایەخ بەلایەنی ئایدیۆلۆجی یان داوە دەربارەی ئایین واتە خراوەتە نێو چوار چێوەیەکی سیاسیی نەك فەلسەفی و ئەپستمۆلۆجی. گومان لەوەدا نیە کەئایین یەکەم دیاردەو دەربڕین و فەلسەفە بووە لەمێژوودا کەچەند رەگەزی دژ بە یەکتری دەگرێتە خۆی وەك خێرو شەڕ، رووناکی و تاریکی، داوێن پاکی و داوێن پیسی، پەرستن و ناپەرستن کە لەکۆتاییدا هەر رەگەزو هێزی خێرو رۆناکی و داوێن پاکی و پەرستن بەسەر دەکەوێ.

واتە یەکەم زمانی مرۆڤایەتی بووەو یەکەم فەلسەفە بووە کەگەلانی جیهان بەهەموو جیاوازی بیری و کەلتووری و ئابووری و سیاسیی و کۆمەڵایەتی و دەروونی یان باوەڕیان پێ هێناوە، بەڵام ئێمە کاتێ باس لەئایین دەکەین دەبێ باسی ئەو گەلەو ئەو کۆمەڵە بکەین کەباوەڕی بەم ئایینە هەیە. واتە دەبێ تایبەتمەندی ئەو میللەتە وەرگرین کەهاو ئایینە لە گەڵ میللەتانی ترەوە. مەبەست لێرە میللەتی کوردە. دەبێ ئێمە بزانین ئایینی ئیسلام چی دەگەیەنێ بۆکوردو کورد بۆ باوەڕی پێ هێنا؟ واتە دەبێ ئێمە پێش ئەوەی تیۆر داڕێژین دەربارەی ئایینی ئیسلام و ئایین بەگشتی دەبێ تایبەتمەندی کوردەواری بزانین بەشێوەیەکی زانستی و لەسەر بنەمای دیاردەکانی کۆمەڵگای کوردەواری نەك لەسەر بنەمای ئایدیۆلۆجی و دەرەکی. پشت بەستن بەبارودۆخی کوردو واقیعی کۆمەڵایەتی و دەروونی و روحی کورد خاڵی سەرەکییە بۆ دۆزینەوەو دەست نیشانکردنی رۆڵی ئایینی ئیسلام لەناو کوردستان. کورد هەر لەسەرەتای مرۆڤایەتیەوە میللەتێکی خاوەن بڕوابووە بەخواو خۆی تەرخان کردووە بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خواو چاکەی خەڵکی ویستووەو ئارامگربووەو خێرکەر بووە هەر لەبەر ئەوانەشە بۆتە ئیسلام. یەکەم بیرو فەلسەفە لای کورد کەتێرامان بێت لەمێژوو و گەردون بیرێکی ئایینی بووەو عەقڵێکی ئایینی بووە. ئەم عەقڵە کەوەك فەلسەفەیەك بەدەردەکەوێت یان بەشێوەی روح بریتی یە لەئایینی لای کورد. پاش بڵاوبوونەوەی



ئـایینی ئیسـلام کـورد زۆر بەپەرۆشەوە وەری گـرت و دەست پێشخەر بوو لەم بوارەداو هەزارەها شەهیدیدا لەپێناوی سەقامگیری و پتەوی ئیسلام کەنموونەش گەلێك زۆرن و نموونـە هـەرە دیارەکـەش (سەلاحەدینی ئەییوبیە).

کـورد پێـش ئـەوەی ئـایینی ئیسلام بێتە سەر دونیا سەرمایەکی زۆری هەبوو لەئایین و کەلتوورێکی فراوانی هەبوو لەم بارەیەوە، لەبەر ئـەوە لایەنـە روحـی و دەروونـی ی مرۆڤـی کـورد ئامادە بـوو ئـایینی ئیسـلام وەرگرێـت و هـەوڵی شێلگیرانەی بۆ بداو سـەری بخـا، وای لێ هـات کـورد خـۆی لـەئایینی ئیسلامدا بدۆزێتەوەو ئیسلام ببێتە جێی شـانازی روحـی و ئـەخلاقی کـورد. ئیسـلام کاتێ ئامۆژگـاری مـرۆڤ دەکا کـە رزگـار دەبـێ لـە ئەشـکەنجەی دۆزەخ و دەچێتـە بەهەشـت لەگـەڵ گشـت پیـاوە موسـڵمانەکان و ئەسـحابەکان و پێغەمبـەرەکان ورەیـەکی بـەرز دەبەخشـێتە مـرۆڤ. لـەقورئانی پـیرۆز وتـەو ئامۆژگاریـەکانی پێغەمبـەری خـوا (محمـد) ﷺ زۆر بەباشـی و بلیمەتانـە وەسـفی دۆزەخ و بەهەشـت کـراوە. هـەموو جـۆرە ئەشـکەنجەکان باسـکراوەو هەموو شتی جوان و بەپێزو بەچێژو پاك و روحـی و ئـەخلاقی بـەرزیش بـاس کـراوە. شـتە دۆزەخـی یـەکان کـورد خـۆی بەسروشـتی بوونـی و دەروونـی خـۆی رەتـی دەکاتـەوەو شـتە بەهەشـتی یەکانیش مرۆڤـی کورد بەبونیاتە بوونی و دەروونـی ی خۆی وەری دەگرێت و هـەوڵ دەدات بیگاتـێ جگـە لەمـەش ئیسـلام رۆڵێکی بەرچاوی هەبووە لـەژیانی ماتریالی و روحی کورد چونکە کورد میللەتێکی جوتیاری یە، جوتیاریش زەوی یەکەی و بەروبومەکـەی بـەندە بـەئاوو هـەواو بـاران و شـتە سروشتی یەکان کە هەموو بەدەست خوای گەورەیە، لەبـەر ئـەوە خـۆی تەرخان کردووە بۆ پەرستنی خوای مەزن. هەروەها ئایینی ئیسلام زۆر کێشـەی کۆمەڵایـەتی بـۆ کـورد چارەسـەر کـردوە وەك ژن هێنـان و منداڵ و میرات و مافی پیاوو مـافی ئافرەت و باوکایـەتی و دایکایـەتی و بیـاوەتی و ژنایـەتی. کـورد خـۆی زۆر حـەزی لـە پـاك و خاوێنی یـە کەئیسـلامیش زۆر بایـەخ بـەپاك و خـاوێنی دەدا، وەك پێنـج فـەرزە دەست نوێـژو نوێژکردن. جگەلەمـە بەرۆژو بـوون شـتێکی زۆر گرنـگ و بەرزە لای موسڵمانی کورد، چونکە مرۆڤـی کـورد شـوێنەوارەکانی زۆر سەختە کە لەهەر زەمانی دێرینـەوە فێری برسێتی و تێنویەتی و ئارامی کـردووە ئەمـەش لـە رۆژوگرتـن دەستەبەر دەکرێت.

پانتایی کوردستان واتـە جـێ و شـوێنەکەی پـڕە لـەچیای بـەرزو دەشـتی پـان و زێ و سـەوزایی و کـانی و کـارێز ئەمانـەش وەك بەخشـینێك و بەرەکـەتێکن لەلایـەن خوای بەخشەندەوە.

ئایینی ئیسلام هـەردەم مرۆڤـی کوردی هـانداوە بـۆ کـاری چاکـەو خـێرکردن و داوێـن پـاکی و بـەجێ گـەیاندنی فـەرزەکانی ئیسـلام وەك نوێـژو رۆژوو زەکـات و حـەج و ژن هێنان و پەروەردەی منداڵ.

رۆژانـی هـەردوو جـەژنیش (رەمەزان و قوربان) زۆر پیرۆزن لای مرۆڤـی کـورد. هـەروەها بۆنەیـەکی زۆر لـەبار بـووە بـۆ کۆمـەڵگای کـوردەواری بـۆ ئـەو کەسـانەی کەناخۆشی یان هەبووەو بەسەردانی یـەکتر ئاشت بوونەتـەوە. ئەمانـەو زۆر شـتی تریـش وا لـەمرۆڤی موسڵمانی کـورد دەکا ئایینەکـەی بپـارێزێت و ئەرکـەکانی بـەجێ بگـەینێت. ئێمـەی رۆشـنبیر دەبـێ بەبەرچاو گرتنـی ئەمانـەی پێشـوو دەیدەمـان رووناکـتر بکـەین بـۆ داکۆکـی کـردن لـە کاریگەریـەتی ئایینی ئیسلام لەسەر کورد.

هـەتا ئێسـتاش تەکیـەکانی کوردستان پڕن لەدەروێشانی خواو ئایینی ئیسلامی پیرۆز. هەڵبەت ئەم جۆرو شێوە پەرستنە بڕواو متمانەی ئـایینی ئیسـلام بـەهێزتر دەکـاو میـهرەبانی و جوانـی و بـەرزی ئایینەکە بەرچاو تر دەکا.





# ئایین و زانستی نوێ

ئا/ فەرهاد قادر

جاری وا هەیە کاری مامۆستاو زاناکانی ئایینی جێگای سەرنج راکێشانە! سەرنجەکەش لەوەدایە، دەبینی لەهەندێ کاتدا باوەڕ بەراستی بنەما زانستی یەکان دەکەن و کاری پێ دەکەن، وەك لەکاتی ئەنجامدانی روکنی نوێژو بەربانگ کردنەوە..هتد، وە لەهەمان کاتدا پشت لەهەمان بنەمای زانستی دەکەن و لێی هەڵدەگەڕێنەوە..

کاتێ مانگی شەعبان پشتمان تێ دەکاو مانگی رەمەزان دەبێتە میوانمان، یان هاتنی جەژنێك لەجەژنەکان رووبەروومان دەبێتەوە، مامۆستاو کۆمەڵە خەڵکێکی زۆر لەسەر بان و دیوارەوە خەریکی بینینی مانگ دەبن، پاشان ئەوەی بینیویانە ئیعلانی دەکەن، زۆر جاران خەڵك سەرسام دەبێ و نازانێ بۆ کام لا سەرهەڵگرێ، بەتایبەتی کاتێ فەتواکان تێك ناکەنەوەو ناتەبا دەبن، بەجۆرێ مەردووم سەری سوور دەمێنێ و قاچێکی دەکەوێتە ئەم لاو قاچەکەی تری دەکەوێتە ئەولا. بەمەش تام و چێژ نە لەجەژنەکەی و نە لەرۆژووەکەی ناکات.

بەر لەوەی بچینە ناو کاکڵەی باسەکەوە، دەبێ ئەم راستی یەمان لەبەرچاو بێ کە مرۆڤ هەر پلەو پایەیەکی هەبێ... هێشتا پێویستی بە عیلم و زانست هەیە.

بەڵێ تاوەکو لەژیاندا بێ، هەر دەبێت بەدوای زانستدا بگەڕێ.

(ئەنیشتاین) وتوویەتی: (مەزنترین و جوانترین هەست کە لەدەروونی مرۆڤەوە سەرهەڵدەدات ئەوەیە کە لەئەنجامی تێڕوانین و بیرکردنەوەو سەرنج دان لەدووری و تاریکی و شاراوەکانی گەردوونەوە بێت).

لێرەدا دەپرسین :

گەردوون چی یە؟و خۆ خەریك کردن بەزانستی گەردووناسی سوودی بۆ مرۆڤ و مرۆڤایەتی چی یە؟

بەڵێ تەنها کۆڕە ئایینییەکان نی یە کە ئەم جۆرە بابەتانەیان تیا باس بکرێ، بەڵکو ئەم کارە بۆتە خولیای مێشکی زانایانی ئەستێرەگەری و زانستگەری یەکان.

گەردوون- بەپێی زانستی نوێ بریتی یە لە کاتژمێرێکی گەردوونی (ساعە کونیە) زۆر ووردی کارئاشنا، لەبەرئەوەی دەستکردی خودای کاربەجێ یە، لەسەر ئەم کاتژمێرە رێك و پێکە پشت راستین و دڵمان ئاسوودەیە پێی.

گومانی تێدا نی یە، ئێمە ناتوانین ئەم کاتژمێرەی گەردوون ببینین، هەروەکو چۆن کاتژمێری ئاسایی دەبینین.

شارەزایانی گەردووناسی کەسەوداگەرییان لەگەڵ گەردوون و بوونەوەردا هەیە، بەم سەرنجدانەیان بۆ ئەستێرەکانی



ئاسمـــان بـــەهۆی تەلەســـکۆپی بینـــایی و رادیۆیـــی وکەشـــتییە ئاسمانییەکانـــەوە توانیویانـــە بروانننە شوێنە زۆر دوورەکان و گەلێ نـــهێنی و ئـــالۆزی ڕوودادەوە گەردوونییـــەکان روون بکەنـــەوە، بەمەش ئەم تەم و مژە برەوێننەوە کە بووەتە پەردەیەك لەنێوان چاوو عـــەقڵ و هەقیقەتـــەکانی ئـــەم گەردوونە.

## کات .. جووڵەیە

ئەو ڕۆژژمێرەی کە پشتی پێ دەبەستین بۆ زانین و دیاری کردنی کـــات و ســـاتەکانمان لـــەخۆوە نـــەهاتووە، بـــەڵکو ســـەرچاوەی لەجووڵـــەی ڕێك و پێکـی گـــەردوون وەرگرتووە.

ئـەوەی گومـانی لەراسـتی ئـەم هەقیقەتانە هەیە، با بگەڕێتەوە سەر قورئانی پـیرۆز بـۆ یەکلاکردنـەوەی ئەم بابەتە.. کـە دەفـەرموێ: ﴿هـو الذي جعـل الشـمس ضيـاء والقمـر نـورا وقـدره منـازل لتعلمـوا عـدد السـنين والحساب، ما خلق الله ذلك الا بـالحق، يفصل الآيات لقوم يعلمون﴾يونس/٥.
لەم ئایەتەدا بەئاشکرا ئاماژە بۆ ئەم هەقیقەتـە دەکـات کـەوا کـاتی گەردوون (الزمن الكوني) یان کاتی زەمینـــی (الزمـــن الارضـــی)، رەنگدانـــەوەی هەقیقەتێکـــە لەجووڵەی گەردوون.

## کاتژمێری ئاسایی بەرهەمی کاتژمێری گەردوونە

ئـەو زەویـەی لەسـەری دەژیـن، ئـەم هـەموو جووڵـە جۆراوجـۆرەی هەیـە (چـوارده جـۆر جووڵانـەوەی هەیە)و ئەو خێراییە گەورەی هەیە بەبێ ئـەوەی هەسـت بەلـەنگی یـان لاسەنگییەك بکەین.

ئەگـەر زەوی بـەدەوری خۆیـا نەخولابایـەوە، ئـەوا کـات دروسـت نـەدەبوو، شـەوو ڕۆژ، ڕۆژهـەڵات و رۆژئاوا، وەرزەکان، هیچ یەك لەمانە نـەدەبوون، یـا ئـەوەتا لەشـەوێکی هەتا هەتایی دەژیایین، یا لەرۆژێکی بێ سەر بن، ئەوکاتە بوونـی ئێمـە مانایەکی ئەوتۆی نەدەبوو، دەتوانم بڵێم ژیانیش هەر نەدەبوو.

بەراسـتی گـەردوون جـوان و ڕازاوەو ڕێك و پێکـــە، ڕەنگـــە کـــەموکوری لـــەچالاکترین و ڕێك و پێکترین سـەربازگەدا ببینـین، بـــەڵام لەســـەربازگەی گـــەردووندا تۆزقاڵێك کـەموکووری و سـەرپێچی نابینین.

لەسـەر ئـەم بنـەما مەحکـەم و ڕێك و پێکانەی گەردوون کـاتژمێری ئاسایی نەخشە کێشراوە.

کـــاتژمێری ئاســـایی ئـــەو هاوسـەنگییەیە کـە زەوی و هـەموو تەنە ئاسمانییەکانی تـر بـەدەوری خۆیاندا دەخولێنێتەوە، بەتایبـەتی جووڵە بەردەوامییەکەی زەوی، زانا فەلەکیـەکان توانیـان یەکـەی کـات دیـاری بکـەن،کـە لـەژیانی ئێمـە ناسـراوە بـە چرکـەو خولـەك و سەعات و ڕۆژ و مانگ...

## ئاین و زانست دوو هێڵی یەکسانن

ســەرەڕای ئــەو پێشــکەوتنە مەزنانـــەی زانســـتی فەلـــەکی بەخۆیەوە بینیویەتی، ئەوانەی کـە دەربـارەی ڕۆژژمـێری گـەردوونی (التقويـم الكونـی) بـــە عەقڵـــە بچکۆلەکـەی خۆیـان و چـاوە کـەم بیناکەیان شتێکی ئـەوتۆ نـازانن، سەری خۆیـان هـەڵدەگرن لـەمانگی ڕەمـەزان و شـەوال تـا بـەچاوە کـەم بیناکەیان مانگ ببینن، دەبێ ئەوانە بێ ئاگا بـن لـەوەی کـە زۆر جـاران چاوی ئاسایی فریو دەخوات.

بوونـــی رادیـــۆ تێلســـکۆپ Radiotelscope نوێــترین ئـــامێری گەردووناسـییە کە زۆر لەمـەودای چـاو دوورتـر دەبینـێ، هیـچ شـتێ نییـە ببێتـە ڕێگـر لەبـەردەم ئـەم ئامێرە بـۆ بینینـی مـانگ، ئەگـەر مرۆڤیش ژیریەکـەی و زانستەکەی بەکارنەهێنێ و کەڵکی لێ وەرنەگرێ بۆ ژیانی ڕۆژانەی، جگە لەخۆی کێ تاوانبارە؟ کە ئەم مرۆڤە لەکاروانی ڕۆشـــــنبیری دواکـــــەوێ و لەشارسـتانیەت و تێگەیشـتن بـێ بـــەهرە بـــێ، بـــەبێ بەشـــی و پەرتـەوازەیی ڕازی بـێ؟ قورئـانی



پـیرۆزیش هـەر ئـەوەمان پـێ ڕادەگەیـەنێت کـە خـودای گـەورە چۆن مرۆڤ هـاندەدات بـۆ خـۆ پـڕ زانیاری کردن بـە هـەر نرخـێ بـێ، کەدەفـەرموێ : ﴿ قـل هـل یسـتوي الذين يعلمون والذين لا يعلمون ﴾.

وە لەفەرموودەیەکی پێغەمبەردا هاتووە کە دەفەرموێ: (اطلبو العلم ولو في الصين).. ئەمرۆ زانست لەژێر دەستماندایە، با کەڵی لێ وەربگرین لەهــەموو ووردو درشـتێکی ژیانمانو، پشت ڕاسـت بین پـێی لـەڕۆژمێرەکانمانو نوێژەکانـمـان لـەژێر ڕێنموونـی ئـەودابین، لەبـەر ئـەوەی ژمێرکـاری فەلـەکی (الحسـابات الفلکیـە) تـەمومژی لەسـەر نی یـە، وەك مـانگی چـواردە ژمێرکاریـەکانی زۆر وورد بـەرێوە دەروات، هیچ کـەم و زۆریـەکی تیـا ڕوونادات.

لەوانەیە ختوورەیەك بەدڵماندا بێ کەئەمـە دەبـێ تـا چ ڕادەیـەك شـەرعی بـێ لـەکاتێکدا لـەقورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێ ﴿ فمن شهد منكم الشهر فليصمه ﴾.. هەر لەفەرموودەی پێغەمبەر ﷺ هـاتووە: (صومـوا لرؤيته وافطروا لرؤيته).

بێگومان بینینی مانگ لەهەموو دەڤەرێکدا ناسەلمێنرێ، هـەروەکو ناتوانێ کاتی نوێژەکـانی لەهـەموو دەڤەرێکدا یـەك بخرێ، یـان کـاتی بـەربانگو کـاتی نییـەتی بـەرۆژوو بوون ناتوانرێ لەهەموو دەڤەرکاندا یـەك بخـرێ، لەوانەیـە ڕۆژووەوان هـەبێ نییـەتی ڕۆژوو بـهێنێ، لەهەمان کاتدا بەڵام لەهـەمان کاتدا لەلایـەکی تـر کەسێکیتر بـەربانگ بکاتەوە، یـان هـەبێ (١٨) کـاتژمێر ســەرۆژوو بـێ، لەهــەمان کــاتدا لەشـوێنێکی تـر کەسـێکی تـر (١٢) یـان (١٥) کـاتژمێر بـەرۆژوو بـێ.. کەواتە بوونی جیاوازی لەکاتەکاندا (الزمن) شـتێکی ئاسـایی یە، هـەر لەبـەر ئـەم هۆیەیـە کـە ئایەتەکـە حوکمەکـەی تاکـە کەدەفـەرمووێ: ﴿فمن شهد منكم الشهر فليصمه ﴾..

بەڵام ئەگەر زانست کارەکانی بۆ دەستەبەرکردی، پێویستە پیـادەی بکـەی. لەبــەر ئــەوەی ئەمانــە لەســەرەتاوە لەســەر سیســتەمی گـەردوونی (النظم الكونية) بەرێـوە دەڕوات.

ئەگــەر ئــاورێك لــەرابردووی پرشــکۆداری خۆمــان بدەینــەوە، دەبینین پێغەمبـەری خـودا ﷺ زۆر لێزانانە مامەڵەی لەگەڵ ئەم جـۆرە هەڵوێسـتانەدا کـردووە لەجـەنگی (بـەدری گـەورە) پێغەمبـەر ﷺ ڕاو بۆچوونـی خـۆی گۆڕیـوە لەسـەر داوای یــەك لەســەربازەکانی کەشــارەزایی لــەکارو بــاری ســەربازیدا هــەبوو، هــەروەها لەمەســەلەی (دار خورماکــان) پێغەمبەر ﷺ پێی وتن: (أنتم اعلم بأمور دنياكم) واتا ئێوە شارەزاترن بەکاروباری خۆتان.

ئەمەیە شێوازی ئایینی ئیسلام بۆ فـێرکردنی مـرۆڤ، کـە جـاری واهەیـە بـواری مـرۆڤ دەدات بـۆ بینینـی ڕۆڵـی خـۆی لەهــەندێ مەسەلەدا.

لێرەدا دەتـوانم بڵێم: یـەکێك لەنهێنییــەکان ســەرکەوتنو گەشـەکردنو مانـەوەی ئـەم ئایینـە لەسەرەوە ئاماژەمان پێکردووە.

پوختـەی باسـەکە ئەمەیـە دەبـێ بـاوەڕ بەسیسـتەمی گـەردوونی (النظم الكونية) بکـەین کـە لەلایـەن خـوای کاربـەجێوە نەخشـەی بـۆ کێشــراوەو، هاوتــەبایی و یەکسانی یەك لـەنێوان ئـەو زانسـتە کـە گـەلێ نـهێنیو ئـالۆزی ڕووداوە گەردوونیــەکانی بــۆ ڕوون کردووینەتەوە، دەست ڕەنگینیو کار بەجێیی خوای گەورەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە.

سەرچاوەکان

١- گۆڤاری (العربی) العدد ٢٣٧

٢- نهێنی ئەستێرەکان. ومحسن علـی احمد

٣- روح الدیـن الاسـلامی عفیـف الطبارة.





# ئیسلام و بیروڕای سەربەست

ئا/ هاوار خدر کۆیی

بەر لەهاتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام هەموو شتێك لە جیهانی وەحشەت و دڕندەییدا خولی خواردبۆوە تەنانەت کەس زاتی ئەوەی نەدەکرد داوای مافی خۆی بکات بەڵام لەئادەمیزاد وەردەگیراو دەدرا بەبەت و سەنەم کەنەرۆح لەبەرو نەبەهەستەوەر نەکەس نەیدەتوانی رۆژێ لە رۆژان بە پێچەوانەی ئەم کردارانە بکات یاخود هەڵوێستی خۆی دەربڕێ کاتێ دەیزانی ئەمانە هەمووی هەڵەن. دوای هاتنە خوارەوەی قورئانی پیرۆز بۆ پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ هەموو شتێ خرایە قالبی خۆیەوە لەڕووی رەخنەو راوبۆچوونی ئازاد لەئایینی ئیسلامدا هەموو مرۆڤێك سەربەستە بیروڕای خۆی دەربڕێ. هەروەك بۆی هەیە لە سنوری فەرماندا بەچاکەو دوورە پەرێزی لەخراپەدا رەخنەبگرێت لە هەر مرۆڤێك لەبچوکترین تا گەورەترین ئەندامی کۆمەڵ جابە تەمەن یا بەدەسەڵات بەمەرجێ رەخنەکەی بەرژەوەندی گشتی تێدا بێت هەڵبەت لەمەشدا پیاوو ئافرەت یەکسان بوون.

بۆ نموونە لەسەردەمی خەلیفە (ئیمامی عومەر) رضي الله عنه کاتێك لەوتاری هەینیدا بوو (سەلمانی فارسی) خاوەنی بیرۆکەی شەڕی خەندەق رەخنەی لە (ئیمامی عومەر) رضي الله عنه گرت و وەڵامی داوە لەسەر ئەوەی لەکاتێکدا لەوڵاتی یەمەنەوە چەند تۆپە قوماشێك هاتبوو بەدیاری ئەمیری موسڵمانانیش واتە (ئیمامی عومەر) هەڵسا بەدابەشکردنی ئەم قوماشە بەسەر موسڵمانانی شاری مەدینەداو هەریەکەو پارچەیەکی بەرکەوت.

لەکاتی ووتارخوێندنەوەکەدا ئیمامی عومەر دو پارچەی لەو قوماشە لەسەر شان بوو (ئیمامی عومەر) وتی گوێ بگرن (سەلمان) هەستاو دوجار بەتوڕەیی وتی ( بەخوا گوێ ناگرین خەلیفە سەری سوڕماو بەئارامییەوە لەسەلمانی پرسی بۆ گوێ ناگرن؟ (سەلمان وتی ئێمە هەموو یەك پارچە قوماشمان وەرگرتووە تۆ بۆ دوو دانەت لەسەر شانە ؟!

یان جارێکی تر (ئیمامی عومەر) لەوتاری هەینیدا فەرمووی ( مارەیی ئافرەت لەچوار سەد درهەم نابێ زیاتر بێت خەلیفە دوای تەواو بونی وتارەکەی ئافرەتێکی قورەیشی بەرەنگاریوەستا ووتی خەلیفە چۆن دەستکاری مافی ئێمە دەکەیت لەکاتێکدا خوای گەورە مافی بۆ داناوین..؟! هەروەها سنووری مارەیی دیاری نەکردووەو خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وان اردتم استبدل زوج مكان زوج واتيتم احداهن قنطاراً فلا تاخذوا منه شيئاً...﴾ النساء / ٢٠

ئیتر دوای ئەمە خەلیفە گەڕایەوەو فەرمووی (خوایە لێم ببورە هەموو کەس لەعومەر شارەزاترە بەئایین. عومەر هەڵەی کردوو ئافرەتێك هەقی دۆزیەوە).

بۆیە هەر کەس بەئارەزووی خۆیەتی چەند دەکات بەمارەیی بیکات. بۆیە دەبێ موسڵمانان لەئاستی راستیو هەقی خۆیان بێ دەنگ نەبن و هەرکات راستی هاتە مەیدانەوە نەهێڵن بستێك بەسەریدا بڕوات بەمەدا بۆمان دەردەکەوێ کە مرۆڤ دەتوانێ لەیاسای ئیسلامدا رای خۆی دەربڕێ هەر وەها بۆی هەیە روبەڕووی گەورەترین ئادەمیزاد ببێتەوە بەمەرجێ مەبەستی خێرو چاکەو خۆشی بێت. هەروەها مرۆڤ بۆی هەیە رەخنەبگرێت هەر کەسێ هەڵەی کردنابێ بەدوای کەوی هەڵەکەی دەرخەی. کەواتە با هەموو جیهان شایەتی پاکیو راستی و ئازادیو سەربەستی تۆ بدات ئەی نێردراوی خوای گەورە ئەی چرای بەختیاری (پێغەمبەری خۆشەویست) لەگەڵ یاسا پیرۆزەکەت.

سەرچاوە:

١- اسلامنا. ٢- العدالة الاجتماعية.



## فەرموودەی پیرۆز

* قورئـانی پـیرۆزو سـوننەتی پـاکی پێغەمبـەر(ﷺ) ئـافرەتو پیـاوان لەبنچینـەی دروستبوونو بەهای مرۆڤانەدا یەکسانو هاوتا کردووە.
* پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (لەیەك دامەبڕێنو واز لەیەکتری مەهێنن و پشت لەیەکتر مەکەنو رقو کینە لەیەکتر دامەگرن، ئیرەییو حەسوودی بەیەکتر مەبەن، چونکە هەمووتان بەندەی خوانو دەبێ یەکترتان خۆش بوێ.
* پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (ئەم ئیسلامە رێگای راستی منەو ئێوەش شوێنی ئەم رێگایە بکەونو بەهیچ رێگایەکی دیکەدا مەڕۆن تا لەرێگای ئیسلام دەربەدەر نەبن، ئەمە فەرمانی خوایە بۆ ئێوە، دە ئێوەش وا بکەن لەخوا بترسن.

## سەرنجێك بۆ نووسەران

* نووسینەکانتان بەخەتێکی جوان بنووسنو دێڕەکان بپەرێنو نێوانیان هەبێت و رەچاوی خالبەندیو رێنووس بکەنو لەسەر یەك دیوی کاغەز بنووسرێ.
* بابەتەکانتان دەستخەت بێت نەك فۆتۆکۆپی، و نـاوی سەرچاوەکان لەگەڵ نووسینەکانتان دیـاری بکەن.
* بوونی وێنەو بەڵگەنامەو هێڵکاری بابەتەکانتان بەهێزتر دەکات.
* ئەو نووسینانەی سوودیان لەفەرموودەکانی پێغەمبەر(د.خ)و ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان وەرگرتووە، ناوی سورەتو ژمارەکەی بنووسن.
* هەر بابەتێك بڵاو نەکرایەوە بۆ خاوەنەکەی ناگەڕێنەوە.
* هەر نووسینو لێکۆڵینەوەیەك لەو گۆڤارەدا بڵاو دەکرێتەوە تێڕوانینی نووسەر خۆیەتی، گۆڤارەکە لێی بەرپرسیار نییە.

دەستەی نووسەران



مناره‌ی مزگه‌وتی گه‌وره‌ی قه‌لآ - هه‌ولێر

**فۆتۆ : فارس سه‌عدی**

